**کارل مارکس**

**فریدریك ئەنگلس**

# ئایدیۆلۆژی ئەڵمانی

**وەرگێڕانی سەلام مارف**

ئایدیۆلۆژی ئەڵمانی

کارل مارکس، فریدریك ئەنگلس

ئەم کتێبە بەرگی یەکەمی کتێبێکی گەورەترە بەناوی (ئایدیۆلۆژیای ئەڵمانی، رەخنە لەفەلسەفەی هاوچەرخ لەرووی نوێنەرەکانییەوە، فیورباخ. ب و بۆئر و شترنر و رەخنەی سۆسیالیزمی ئەڵمانی لەرووی پەیامبەرە جۆراو جۆرەکانییەوە)و گرنگترین بەشی کتێبەکەیەو بەشەکانی تر بریتین لەپلمیك لەگەڵ هیگلییە لاوەکانو سۆسیالیزمی حەقیقی ئەڵمانیدا. مەبەستی مارکسو ئەنگلس لەم کتێبەدا ئەوەیە کە ئایدیۆلۆژیو فەلسەفەی ئەو کاتی ئەڵمانی بدەنە بەر رەخنەو لەبنەڕەتەوە رەتی بکەنەوە. لەم رێگایەیەشەوە خاڵە سەرەکییەکانی روانگەی خۆیان بۆ ماتەریالیزمی مێژوویی باس کردووە.

چاپی یەکەم ____________ 2000

## پێشەکی چاپی کوردی

خواستی بورژوازیو خاوەندارێتی تایبەت، تەنها هەر بەوەوە ناوەستێتەوە کە بەشێوەی ناعادیلانە، پێویستییە مادییەکانی ژیانو هۆکانی بەرهەمهێنانو لایەنەکانی تری ژیان زەوت بکەنو دەستی بەسەردا بگرنو هەموو ژیان بخەنە نێو بازنەی قازانجپەرستی خۆیانەوە، بەڵکو هەوڵی ئەوەش دەدەن، ئەو هۆکارو دامەزراوانەش کۆنترۆڵ بکەن کە کاری بەرهەمهێنانی هۆش ئەنجام دەدەن، تاکو لێرەوە بەو ئامانجە بگەن، جەماوەرێکی فراوانتر ناچاری پەیڕەوکردنی بیرو بۆچوونو تێگەیشتنەکانی خۆیان بکەن، تابتوانن، لەنێو سیستەمی ملکەچیو کۆتکردنی مرۆڤ بەهێزە مادییەکانەوە، تەمومژێك دروست بکەن کە مرۆڤەکان بەرپێی خۆیان نەبیننەوەو مرۆڤایەتی لەسەر لێواری مردنو ژیان بەپێی حساباتی قازانجپەرستی خۆیان ڕاگرن.

لێرەوەیە، خوێندنەوەی وردی مارکسیزم ئەهمیەتێکی زۆری هەیە بۆ ئەو کەسانەی ناڕازین بەدنیای ئەمڕۆی نابەرابەرو چاویان بڕیوەتە سبەینێی مرۆڤایەتی، ئەم کارەی هاوڕێ (سەلام)یش لەو ڕوانگەیەوە لەدوو لایەنەوە گرنگو بایەخدارە، لەلایەك بابەتێکی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردیو، لەلایەکی تریشەوە بابەتێکی باشو گرنگی هەڵبژاردووە، تا بەخوێنەرانی ئاشنا بکات، کە مارکس چەند بابەتیو زانستیانە مێژووی ناکۆکیەکانو تێگەیشتنە ناواقیعییەکان هەڵدەسەنگێنێتو چۆن ڕێگاچارەکانیشی دیاری کردووە. کاری وەرگێڕان ئەهمیەتێکی زۆری هەیە، گەرچی تا ئێستا وەك پێویست حیزبو ڕێکخراوە شیوعیو سۆسیالیستیەکان ئەم بۆشاییەیان پڕ نەکردۆتەوەو فەرامۆشیان کردووە، هەر بۆیە ئێستا لەنێو بزوتنەوەی چەپدا، هەست بەنەوەیەکی لاوی سۆسیالیست دەکرێت کە بەبێ شارەزابوون لە ئەدەبیاتی کلاسیك، دەیانەوێت لەمەیدانە جۆراوجۆرەکانی ئەو ڕێبازەدا خەبات بکەن، بەڵام بەهۆی بێ ئاگاییو نەبوونی ئەدەبیاتی پێویست بەزمانی کوردی توشی هەڵەو لادان بوون. هەر بۆیە چاکتر وایە سۆسیالیستەکان ئەم کارە پڕ بایەخە فەرامۆش نەکەنو ئاوڕێك لەکاری وەرگێڕان بدەنەوە، کە ڕەنگە ئەم کارەیان گەر بەدروستی ئەنجام بدرێت، لەهەندێك کاری لاوەکیو ڕێکخراوەییو حیزبیان بۆ بزوتنەوەکە بەسوودتربێت.



ئایدیۆژی ئەڵمانی جگە لەوەی ڕەخنەیە لەهیگلیەت، تیشکێك دەخاتە سەر ئەو فەلسەفەو چەمکانەش کە لەئاسمانەوە دادەبەزینە سەر زەوی، هەروەها ڕەخنە لەو تێگەیشتنە هەڵانەش دەگرێت کە پێیان وایە هوشیاری ژیان دیاری دەکات، بەڵام مارکس بەپێچەوانەوە ئەوە دەسەلمێنێت کە ژیان هۆشیاری مرۆڤەکان دیاری دەکات، هەر بۆیە ئاماژە بەتێڕوانینەکانی فیورباخ دەکاتو ڕەخنە ئاڕاستەی ئەو بۆچوونانەی دەکات کە لای وایە پەیوەندییەکان دەبێت لەوێوە بناسرێنەوە کە لەحەزو خۆشەویستی تێناپەڕنو بەشێوەیەکی ئایدیالیانە پەیوەندییەکانی تاوتوێ دەکردو بەشێوەیەکی ماتریالیستیانە نەدەچووە سەر مێژوو، کاتێکیش دەچێتە سەری بەو شێوەیە دەیبینێتەوە کە ماتریالیزمو مێژوو لەیەکدی جیا دەبنەوە.

مارکس وێرای ئەوەی کە خۆی قوتابیەکی قوتابخانە فەلسەفیەکانی پێشخۆیەتیو دەورانێك لەژێر کاریگەریەکانیاندا بووە، بەڵام ڕەخنە لەچەمکی تێگەیشتنو هوشیاریو فکرەکان دەگرێتو ئەو نهێنیانە ئاشکرا دەکات کە ئەوان پەییان پێنەبردووەو هەڵەکانیان دەستنیشان دەکاتو ئەو ڕاستیەمان پێدەڵێت: کە هوشیاری هەرگیز ناتوانێت شتێکی جیا بێت لەبونێکی هوشیارانەو بوونی ڕەوتی ژیانی واقعی ئەوان، هەر بۆیە ڕەخنە لەهیگلیە لاوەکان دەگرێت، کە بەرهەمەکانی هەست بەبوونێکی سەربەخۆ سەیر دەکەنو دەیانویست بەهەوڵی گۆڕینی هوشیاری دنیای واقیع بگۆڕن، لەجێگەی ئەم تێگەیشتنە خەیاڵیەدا باس لەهوشیاری کۆمۆنیستی لەسەر ئاستی جەماوەر دەکاتو گۆڕینی مرۆڤەکان لەنێو چوارچێوەی بزوتنەوەیەکی کردەوەییدا، واتە لەشۆڕشدا، نیشان دەداتو لای وایە ئەمەیە کە لەتوانایدا هەیە گۆڕانکاری بکاتو دەسەڵاتی خاوەندارێتی دەستکۆتا بکات، چونکە پێویستی ئەم شۆڕشە هەر لەبەر ئەوە نیە تا بەسەرکەوتنمان بگەیەنێت، بەڵکو بەهۆی ئەمەشەوەیە کە دەتوانین خۆ لەهەموو گەندەڵییەکانی پێشوو ڕزگار بکەینو شایستەی پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی نوێ بین. واتە مارکس وەك ئەوانی پێشوو هەر بەوە نەوەستایەوە کە تەفسیر بۆ هەلومەرجەکان بکاتو لەجێگەو ڕێگەی خۆیان بەجێیان بهێڵێت، بەڵکو بەخوێندنەوەیەکی وردی واقیع ئەو جیهانبینیو هێڵانەشی دەست نیشان کرد کە مرۆڤ چۆن دەتوانێت لەڕێگەیەوە بەکارێکی کردەییو جەماوەریی خۆی لەهەلومەرجەکان ڕزگار بکات.

مارکس سەبارەت بەڕەوەندەکانی مێژووش دەڵێت: مێژوو بەرەنجامی چالاکی نەوە یەك لەدوای یەکەکانیەتی کە هەریەکەیان لەسەر شانی نەوەکانی پێشووتر ڕاوەستاوەو دەسکەوتە مرۆییەکان بەدەستەوە دەگرێتو گەشەی پێدەدات، بەو پێیە سیستمە

کۆمەڵایەتیەکەی بنەمای پێویستی گۆڕاوەکان چاك سازی دەکات. هەر بۆیە مێژوو شتێکی جیا لەبەردەوامی ئەوە جیاوازەکان نیە کە هەریەك لەوان سود لەکەرەستەکانو زەخیرە سەرمایەکانو هێزە بەرهەمهێنەکان وەردەگرێت، ئەمەش مانای وایە لەلایەکەوە چالاکی دێرینە لەهەموو مەرجێکی تەواو گۆڕدراودا درێژە پێئەدەنو لەلایەکی تریشەوە بەچالاکیەکی تەواو گۆڕاو و تازەوە هەلومەرجی کۆن دەگۆڕن. ئەم تێگەیشتە ئەوەمان نیشان دەدات کەسەقامگیریو تێگەیشتنی مادیانە بۆ مێژوو، جیاوازە لەو تێڕوانینە ڕاڕایانەی ئایدیالیستەکان کە پراکتیك بەهۆی فکرەکانەوە ڕوون دەکاتەوە، بەپێچەوانەوە لای مارکس پێکهاتەی فکرەکان بەهۆی پراکتیکی مادییەوە ڕوون دەکاتەوەو ئەو لایەنەش ئاشکرا دەکات کە بەرهەمەکانی هوشیاری، لە  توانایدا هەبێت، تەنها بەرەخنە لابرێتو بتوێنرێتەوە، تا ئەو ڕادەیەی ئەو ڕاستییە دەخاتە ڕوو کە مرۆڤەکان هەلومەرجو دەورانەکان پێکدەهێننو هەلومەرجو دەورانەکانیش مرۆڤەکان پێکدەهێنن. کاتێکیش تیشك دەخاتە سەر کۆمەڵگای مەدەنیو ئازادی تاکە کەس لەنێو کۆمەڵگادا، ئەوە دەستنیشان دەکات لەژێر دەسەڵاتی بورژوازیدا وابەرچاو دەکەوێت کە مرۆڤەکان لەهەموو کات ئازادتر دێنە بەرچاو، بەڵام لەڕاستیدا پێچەوانەیە، هەرچەندە لێرەدا کۆمەڵە سروشتیەکانی وەك خێڵو تایەفە  هتد بەرەو پوکانەوە دەچنو، لەم ڕووەوە پێشرەوی دەکرێن، بەڵام ئەوان لەژێر فەرمانڕەوایی هێزە مادییەکاندا دەمێننەوە، هەروەها لەهەمان کاتدا تاکەکان ناتوانن لەئاڵوگۆڕی هاوچەرخی جیهان بەهرەمەندبنو خزمەت بکرێن، مەگەر ئەوەی کە هۆیەکانی بەرهەمهێنان بخرێتە ژێر دەسەڵاتی هەموانەوە، پاشان ئازادی تاکە کەسەکانیش  لەوێوە دەتوانرێت بەدەست بهێنرێتو ئەوان لەپەراوێز بوون ڕزگاریان ببێت! کە لەنێو کۆمەڵگا هۆکاری پێگەیاندنی ئەم  ئامادەییەی تاکەکان برەخسێنرێت، هەربۆیە  تا ئەو دابەشکردنە ناعایدلانەیەی کار، کە سەرجەم ناکۆکیەکانی لەخۆ گرتووە، بەزیندوێتی بمێنێتەوە، تەنانەت دابەشکردنی کاری ناو خێزانیش، دیسانەوە دابەشکردنەوەی ناعادیلانەی کارو بەرهەمەکانی کە لەهەناویدا سەرلەنوێ پەیوەندی تازەو بەیەکگەیشتنەوەی تازەی لێدەکەوێتەوەو پێچەوانەی خواستی زۆرینەی تاکەکانی کۆمەڵ دەبێتو ئاکامەکەشی هەر پێچەوانەی ئەو خواستە دەبێت کە ئەمڕۆ لەهەموو ڕوویەکەوە هێزو توانای بەشداری کاریگەرییانەی لەبەر تاکەکانی کۆمەڵ بڕیوە.

**کەمال ڕەوف**

2001/4/7

# چەند ووشەیە کی پێویست..

1

ئەگەر لەناو کتێبخانەی کوردیدا، بڕوانینە ئەدەبیاتی مارکسی دەبینین کە وەرگێڕانی دەقە سەرەکییەکانی مارکس‌و ئەنگلس‌و لینین، ئەگەر لەحاڵی نەبووندا نەبن، ئەوا هێندە کەمن کە لەبەراورد لەگەڵ ئەدەبیات‌و نووسراوە مارکسییە ئەسڵ‌و کلاسیکییەکاندا، هیچ نین‌و تەنها سوچێکی کەمی ئەو باسانە کراونەتە کوردی. ئەمەش لەلایەکەوە بێ ئاگایی‌و دەست نەگەیشتن بەنووسراوە ئەسڵی‌و کلاسیکییەکان، دەکاتە کارێکی قورس‌و زۆرترین کرێکاران‌و زەحمەتکێشانی کوردستان لەخوێندنەوەی راستەوخۆی ئەو ئەدەبیاتانە بێ بەش دەکات. بەدەر لەمەش دەست نەگەیشتن بەو ئەدەبیاتانە لەناو ریزی کۆمۆنیستەکانیشدا کاریگەری خراپی خۆی بەجێهێشتووە. چونکە لەدوا جارداو لەغیابی خوێندنەوەو تێگەیشتنێکی قووڵی ئەم باسانەدا، لێکدانەوەو جێگیربوونی دەزگای فکری‌و تحلیلی نادروست، لێکدانەوەی غەیرە مارکسی‌و دژ بەرەوتی سۆسیالیستی، جێگیر بوون‌و دەبن‌و لەجێی فکری مارکسی‌و زۆربەی جاریش بەناوی ئەوەوە نمایش دەکرێن. بەم جۆرە شیکردنەوەی کۆمەڵ بەپێی میتۆدو مەنهەجی مارکسی دەبێتە لاوەکی‌و بۆچوونەکانی تر، دەبنە فکری زاڵ‌و دەبنە بنەمای دەزگای تحلیل کردن. ئەمە لەئێستادا تا ئەو ئاستە رۆیووە کە بێ ئاگاییەکی تەواو لەمارکسیزم لەناو ریزی کۆمۆنیستەکاندا باو بێ‌و هیچ جۆرە بەئەنجام گەیاندن، رەتکردنەوە یان لایەنگری لەباسێك .، بەگەڕانەوە بۆ مارکسیزم مەیسەر نەبێت. ئەم واقعیەتە زیانی خۆی داوەو درێژەکێشانیشی سەرەنجام خەباتی کرێکاران‌و زەحمەتکێشان بۆ رزگار بوون لەچەوسانەوەی سەرمایەداری‌و بۆ دەستگەیشتن بەئازادی واقعی لە لەفافی وەهم‌و



خۆشخەیاڵییەکانی وورده بۆرژوازیدا دەپێچێت‌و لەحاڵەتی دەست نەگەیشتن بەم تیۆرییە شۆڕشگێڕییە، بزووتنەوەکەش رەوتی شۆڕشگێڕانە لەدەست ئەدا. مارکسیزم ئەو تیۆریەیە کە رەوتی خەبات بۆ ئازادی واقعی لەرەوەندی بەرەو پێش چوونی مێژوودا دەبینێتەوە، مێژوویەك کەئینسانەکان رۆژانە خۆیان، هووشیارانانە یان ناهووشیارانە، پێکیدەهێنن.چەکدار بوون بەم تیۆرییە مەرجێکی سەرکەوتنی خەباتی چینایەتی کرێکارانە.

ئەم کتێبەی بەر دەستان یەکێکە لەو نووسراوە سەرەکی‌و پڕ بایەخانەی کەتوانای ئەوەمان ئەداتێ بەقوڵی لەروانگەی مارکس‌و ئەنگلسەوە کۆمۆنیزم، ئەویش لەرەوەندی گەشەی ماددی‌و مێژوویی‌و لەخەباتی چینایەتیدا بناسین‌و وەك دیاردەیەکی عەینی بەرەسمی بناسین ..

2

ئەم کتێبە بەرگی یەکەمی کتێبێکی گەورەترە بەناوی (ئایدیۆلۆژیای ئەڵمانی، رەخنە لەفەلسەفەی هاوچەرخ لەرووی نوێنەرەکانییەوە، فیورباخ. ب و بۆئر و شترنر و رەخنەی سۆسیالیزمی ئەڵمانی لەرووی پەیامبەرە جۆراو جۆرەکانییەوە)و گرنگترین بەشی کتێبەکەیەو بەشەکانی تر بریتین لەپلمیك لەگەڵ هیگلییە لاوەکان‌و سۆسیالیزمی حەقیقی ئەڵمانیدا. مەبەستی مارکس‌و ئەنگلس لەم کتێبەدا ئەوەیە کە ئایدیۆلۆژی‌و فەلسەفەی ئەو کاتی ئەڵمانی بدەنە بەر رەخنەو لەبنەڕەتەوە رەتی بکەنەوە. لەم رێگایەشەوە خاڵە سەرەکی‌یەکانی روانگەی خۆیان بۆ ماتەریالیزمی مێژوویی باس کردووە.

ئەم کتێبە لەنێوان ساڵەکانی 1845-1846 دا نووسراوە، بەڵام سەرباری هەوڵدانێکی زۆر، لەلایەکەوە بەهۆی سەرکوتی پۆلیسی‌و لەلایەکی ترەوە بەهۆی ملنەدانی بڵاوکەرەوەکانی ئەو کات کە بەزۆری لایەنگری رەوتی رەخنە لێگیراو بوون، سەرەنجام نەیانتوانیوە بڵاوی بکەنەوەو تا دەورو بەری سەرەتای

سییەکانی سەدەی رابردوو، کەبڵاو کرایەوە، هەروا وەك مارکس خۆی دەڵێت (خرابووە بەردەم گازی رەخنەگرانەی مشکەکان).

ئێمەش ئەم کتێبەمان لەسەر دەقێکی فارسی کە لەبڵاوکراوەکانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانەو (عبدالله مهتەدی) وەریگێڕاوە، کردۆتە کوردی. جێگای خۆشییەتی ئیشارەت بەوە بدەین کە سوودیشمان لەوەرگێڕانە عەرەبییەکەو دوو وەرگێڕانی تری فارسی وەرگرتووە، بەڵام ئەسڵ لامان وەرگێڕانە فارسییەکەی یەکەمە.

3

لەبەر ئەوەی ئەم کتێبە لەکاتی ژیانی نووسەرەکانیدا بڵاونەکراوەتەوەو وەك دەستنووسێك ماوەتەوەو بەردەوام لەبەر دەستیاندا بووە، لەلایەن نووسەرەکانییەوە بەردەوام دەستکاری کراوەو لێی زیادکراوەو سەر لەنوێ لێی دارێژراوەتەوەو پەراوێزی بۆ نووسراوەو لێشی لابراوە، بەکورتی لە دواجاردا شێوەی کتێبێکی تەواو نەکراو بەخۆیەوە دەبینێ. هەر بۆیە لەکاتی چاپکردندا ئەمە لەبەر چاو گیراوەو نووسراوە خەت بەسەرا هاتووەکانو پەراوێزی نووسەرەکانو تێبینی رێکخەرانی کتێبەکە بۆ چاپو تێبینی وەرگێڕەکانی لەگەڵدا هاتووە. سەرجەم تێبینیو پەراوێزەکانی مارکسو ئەنگلس لەپەراوێزەکانی ئەم کتێبەدا هاتوون، تێبینی رێکخەرەکانی بە (ڕ) دیاریکراونو بەگوێرەی (ا.ب ) ریز کراون، لەناو دەقەکەشدا خراونەتە ناو کەوانەیەکی لەم جۆرەوە [ ]. تێبینی وەرگێڕی فارسی بە (و.ف)و تێبینییەکانی خۆشم بە (و.ك) دیاریکردووە. کەئەمانە بەزۆری دەکەونە کۆتایی کتێبەکەوە. بوونی ئەو تێبینیو پەراوێزانە تەنها بۆ ئەوەیە کە زانیاریو رێنوێنی زیاتر بدەنە خوێنەر، دەنا خوێنەر ئەتوانێ بەسەریاندا تێپەڕبێت بێ ئەوەی هیچ کارگەرییەك لەسەر تێگەیشتن لەناوەڕۆکی سەرەکی دەقەکە دابنێ.



4

ئەم کتێبە ماوەیەکی دوورو درێژە وەرگێڕدراوەو ئامادەی چاپ بووە، بەڵام بەهۆی بەرتەسکی مەودای ماددی بۆ بڵاوکردنەوەی کتێبەکە، بڵاوکردنەوەی دواکەوت. لەگەڵ ئەمەشدا دواکەوتنی بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە، فرسەتێکی زیاتری بەمندا کە بەردەوام پیایە بچمەوە. هەم لەرووی وەرگێڕانو هەم لەرووی هەڵەی چاپەوە، بەگوێرەی توانا پاراوتر بێت. ئەم کارە بێ هاوکاری چەند هاوڕێیەك مومکین نەدەبوو، کە من لێرەدا سوپاسی هاوکارییان ئەکەم.

بەو ئومێدەیشم خوێنەران لەهەر جۆرە تێبینییەك لەسەر ئەم وەرگێڕانە کە لایان دروست دەبێت ئاگادارم بکەنەوە، تا ئێمەش لە چاپکردنەوەکانی داهاتوو یان لەوەرگێڕانی بەرهەمەکانی تردا رەچاویان بکەین.

س.عارف

سلێمانی 2000/9/3

# پێشــــه کی

**تائێستا ئینسانەکان بەردەوام بۆچوونی نادروستیان دەربارەی خۆیان، سەبارەت بەوەی کە چین و دەبێت چیبن، هێناوەتە دی. ئەوان پەیوەندییەکانی خۆیان بەگوێرەی بۆچوونەکانیان لەسەر خوا، ئینسانی ئاسایی و شتی لەم جۆرە دارشتووە. جڵەوی بەرهەمە دەماغییەکانیان لەدەست دەرچووە. ئینسانەکان، واتە داهێنەرەکان، لە بەرامبەر داهێنانەکانی خۆیاندا بەچۆکدا هاتوون. رێگا بدە ئەوانە لە خەیاڵە پووچەکان، بۆچوونەکان، دووگمەکانو ئەو بونەوەرە خەیاڵیانەی کەئەوانی خستۆتە ژێر نیزەوە رزگار بکەین. رێگا بدە لە دژی دەسەڵاتدارێتی تێگەیشتنەکان راپەرین . یەکێك دەڵێ1 رێگا بدە ئینسانەکان فێربکەین ئەو فکرانە بخەنە جێگای ئەم بۆچونانە کە لەگەڵ زاتی ئینساندا دێتەوە، ئەوی تر دەڵێت2 ئەوان فێربکەین کە بەچ جۆرێك هەڵوێستێکی رەخنەگرانە لە بەرامبەر ئەوانەدا وەربگرن و سێیەم دەڵێت3ئەوان فێربکەین کە بەچ جۆرێك ئەم بۆچوونانە لەسەری خۆیاندا دەربهێنن و بەم شێوەیە ئەو واقعیەتەش کە هەیە لەناو دەچێت.**

**ئەم ئامۆژگارییە پاك و منالآنەیە ناوکی فەلسەفەی نوێی "هیگلییە لاوەکان"4 پێکدەهێنێت، فەلسەفەیەك کە نە تەنیا سەرجەم خەڵکی ئەڵمانیا بەترس و لەرزەوە قبوڵیان کردووە، بەڵکو راگەیاندنی ئەوە لەلایەن *قارەمانانی فەلسەفەیی* ئێمەیشەوە هاوکات بووە لەگەڵ وەستانەوەیەکی شێلگیرانە لە بەرامبەر مەترسی جیهانی شێواو و بێبەزەییە تۆبەکارانەکەی ئەودا. ئامانجی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە ئەوەیە کە پەردە لەسەر ئەم مەرانە کە خۆیان خستۆتە جێگای گورگ و لە جیاتی گورگ وەرگیراون لابەرێت، دەریبخات کە باعەباعەکانی ئەوان تەنیا لاسایی کردنەوەیەکی تێگەیشتنەکانی چینی ناوەراستی ئەڵمانیایە بەشێوەیەکی فەلسەفی، وە دەریبخات کە لا ف لێدانەکانی ئەم لێکۆڵەرەوە فەلسەفیانە تەنیا رەنگ دانەوەیەکە لە نەگبەتباریەکانی هەلومەرجی واقعی ئەڵمانیا. ئامانجی ئەوە، ئەمەیە کە ئەم خەباتە فەلسەفییە لەدژی سێبەرەکانی واقعیەت، کەبۆ نەتەوەی خەیاڵ ئامێزو شڵەژاوی ئەڵمانیا سەرنج راکێشە، بدرێتە بەرگاڵتە پێکردن و بێ ئیعتیبار بکرێن .**



**رۆژگارێك پیاوێکی بەجەرگ لەو بروایەدا بوو کە ئینسانەکان تەنیا بەهۆی ئەمەوە لە ئاودا نقوم دەبن چونکە توشی دڵەراوکێی *بۆچوونی راکێشان* بوون. ئەگەر ئەوان بهاتنایەو ئەم بروایەیان، بۆنموونە، دانانی ئەوە وەك خەیاڵێك یان تێگەیشتنێکی دینی، لەسەری خۆیان دەربهێنایە، پتەوانە لە بەرامبەر هەر مەترسییەك لەلایەن ئاوەوە پارێزراو دەبوون. ئەو لەسەرانسەری ژیانی خۆیدا لەدژی وەهمی راکێشان، کە هەموو ئامارەکان بەڵگەی تازەو جۆراوجۆریان لەئەنجامە زیانبارەکانی دەخستە خزمەت ئەوەوە، تێکۆشا. ئەم پیاوە بەجەرگە لەقوماشی هەمان فەیلەسوفە شۆرشگێرە نوێکانی ناو ئەڵمانیا بوو.***

---

* _[ ئەم بەشەی خوارەوە لەدەستنووسەکەدا خەتی بەسەردا هاتووە:] هیچ جۆرە جیاوازییەکی تایبەت لەنێوان ئایدیالیستی ئەڵمانیو ئایدیۆلۆژی سەرجەم نەتەوەکاندا نییە. ئەمیش جیهان بەژێردەستەی فکرەکان دەزانێت، فکرەکانو تێگەیشتنەکان هەروەك ئسوڵی دیاریکەر دادەنێت و باوەرێکی دیاریکراو هەر وەك رازی جیهانی ماددی کەبۆ فەیلەسوفەکان شایانی هاتنەدەستە، ئینکار دەکات. هیگل ئایدیالیستی پۆزەتیفی پێگەیاند. ئەو تەنیا تەواوی جیهانی ماددی بەجیهانی فکرەکانیان و تەواوی مێژووی بەمێژووی فکرەکان نەگۆری . ئەو بەدارشتنی هەویەتە فکریەکان رازی نەبوو ، ئەو بەشوێن پێناسەکردنی کاری داهێنەرانەیشەوە بوو.

به وەخەبەر هاتنەوە لەدنیای خەیاڵیاندا، فەیلەسوفە ئەڵمانیەکان لەدژی جیهانی فکرەکان نارەزایەتی دەردەبرن . جیهانێك کە نیسبەت بەئەو ... تێگەیشتنی واقیعی ماددی...

هەموو رەخنەگرە فەلسەفییەکانی ئەڵمانیا بەقوڵی لەو باوەرەدان کەجیهانی واقعی ئینسانەکان، تائێستا فکرەکان، بۆچوونەکان و تێگەیشتنەکان خستوویانەتە ژێر دەسەڵاتەوەو دیاریدەکەن و جیهانی واقیعی بەرهەمی دنیای فکرەکانە. [ گوایە] رێچکەی تائێستا ئەمە بووە، بەڵام دەبێت بگۆردرێت. ئەم رەخنەگرە فەلسەفیانە بەشێوەك کە مەبەستیانە بەگوێرەی ئەوە بەشەریەت، کە بەپێی ئەوان لەژێر باری فکرە بەردینیەکانی خۆیاندا دەناڵن رزگار بکەن، جیاوازییان هەیە. ئەوان لەئاستی ئەو شتەی بەناوی فکرەبەردینیەکانەوە رایدەگەیەنن، ناکۆکن. [بەڵام] هاوران لەباوەربوون بە باڵا دەستی فکرەکان، هاوران لەباوەربوون بەوەی کە بورهانی رەخنەگرانەی ئەوان دەبێتە هۆی تێکدانی سیستەمەکە: زیاتر لەوەی کە ئەوان چالاکی عەقڵانەی پەرتەوازەی خۆیان بە تەواو بزانن یان بیانەوێت کە ئاگایی گشتی بەدەست بهێنن.

بروابوون بەوەی کە جیهانی واقیعی بەرهەمی دنیای فکرەکانە، ئەوەی کە دنیای ئەندێشەکان...

فەیلەسوفە ئەڵمانیەکان کەبروای خۆیان بەدنیای فکرەکانی هیگلی لەدەست داوە، لەدژی دەسەڵاتی ئەندێشەکان، ئەو فکرو تێگەیشتنانەی کە بەبروای ئەوان، واتە بەگوێرەی ***وەهمی هیگل*** ، تائێستا جیهانی واقیعی هێناوەتەدی، دیاریکردووەو خستویەتیە ژێر دەسەڵاتەوە، نارەزایەتی دەردەبرن . ئەوان نارەزایەتی خۆیان دەکەن و دەریدەبرن...

بەگوێرەی سیستەمی هیگلی، فکرەکان، ئەندێشەکان و تێگەیشتنەکان، دنیای واقیعی ئینسانەکان، دنیای ماددی ئەوان، پەیوەندییە واقیعیەکانی ئەوانی پێك هێناوە، دیاریکردووەو خستویانەتە ژێر دەسەڵاتەوە. پەیرەوانی شۆرشگێری ئەو ئەمە بەدەستەوە دەگرن...

## فیورباخ.
## بەرامبەر کێی ڕواذ گەی ماتەریالیستی و ئایدیالیستی

## [I]

بەپێی ئایدیۆلۆژیستە ئەڵمانیەکان، ئەڵمانیا لەچەند ساڵی ڕابردوودا شۆڕشێکی بێ‌ها وتای تێپەڕاندووە. پەرتەوازەبوونی سیستەمی هیگلی، کە بە شتراوس5 دەستی پێکرد، گۆڕا بە خرۆشانێکی گشتی کە تیایدا هەموو "دەسەڵاتەکانی ڕابردوو" پاك کرانەوە. لەم شڵەژانە گشتییەدا ئیمپراتۆرە بەهێزەکان سەریان دەرهێنا تەنیا بۆئەوەی کە پووکانەوەی خێرای خۆیان ببینن، قارەمانە زوو تێپەڕەکان دەرکەوتن تا بەدەست نەیارە ئازاو بەهێزەکانی ترەوە دووبارە بخرێنەوە گۆمی وونبوونەوە. ئەمە ئەو جۆرە شۆڕشە بوو کە شۆڕشی فەڕەنسا لەپاڵیدا بەیاری منداڵانە دەژمێردرا، خەباتێکی جیهانی کە خەباتەکانی دیادۆخی6 لەچاویدا بەهیچ دائەنرا. ئسوڵەکان یەکتریان بێ ئیعتیبار دەکرد، پاڵەوانانی فکری یەکتریان بەتووندییەکی بێ وێنەوە دەخستە ژێرەوەو لەسێ ساڵی 1842 ـ 1845دا زیاتر لەوەی کەلەسەردەمەکانی تردا سێ سەدە درێژەی دەکێشا، لە ئەڵمانیا پاکسازی کراوە.

هەموو ئەمانە وەك بڵێی لە مەیدانی فکری ڕووتدا ڕوی داوە.

بێگومان ئێمە سەرو کارمان لەگەڵ ڕوودا وێکی سەرنج ڕاکێشدا هەیە: داتەپینی ڕۆحی رەها. بەلەدەستدانی دوا ڕۆشناییەکانی ژیان، بەشە جۆراوجۆرەکانی ئەم جێماوە لەبەر یەك هەڵوەشایەوە، پێکهاتێکی نوێی پێکهێنا و کەرەسەیەکی نوێی ڕێکخست. خاوەنانی پیشەسازی فەلسەفە، کە تائەو کات بە بەکارهێنانی ڕۆحی رەها دەژیان، ئێستا چنگیان لەپێکهاتێکی نوێ گیرکردووە، هەریەکە بەتامەزرۆییەکی تەواوەوە دەستیکرد بەئیشی ووردەفرۆشی بەشی خۆی. ئەمە بەناچار بەرەو ململانێ ملی نا، کە لەسەرەتاوە بەگوێرەی خۆی موئەدەبانەو توندوتۆڵ دەچووە پێش. دواتر کاتێك کە بازاڕی ئەڵمانیا پڕ بوو، وە کالا بەپێچەوانەی هەموو هەوڵەکان لە بازاڕی جیهانیدا پێشوازی لێنەکرا، کاسبی بەشێوەی باوی ئەڵمانی بەرەو خراپی ڕۆیشت: بە بەرهەمە هەرزان و قەڵبەکان، دابەزینی چۆنایەتی، خراپی لە کەرەسە سەرەکیەکاندا، تەزویر لەسەر لەزگەکان، کڕیارە دروستکراوەکان، سەفتەبازی و سیستەمێکی ئیعتیباری بەتاڵ لەهەر جۆرە بنەمایەکی واقعی. ململانێ گۆڕا بەخەباتێکی قینا ویانە کە ئێستا کەوتۆتە بەرستایشکردن و وەك ئاڵوگۆڕێکی گرنگی جیهانی و لەخۆگری ئەنجام و دەستکەوتە سەیرەکان پێناسە دەکرێ و دەخرێتە بەر دەممان. ئەگەر بمانەوێت نرخی ڕاستەقینەی ئەم زمان لووسییە فەلسەفییە، کە تەنانەت لە دڵی هاووڵاتی چاکی ئەڵمانیشدا ڕۆشناییەك لەهەستی نیشتیمانپەروەرانە دادەگیرسێنێت، هەڵبسەنگێنین، ئەگەر بمانەوێت زەبوونی و بەرتەسکی ناوچەیی بزووتنەوەی هیگلییە لاوەکان و بەتایبەتی ناکۆکی کۆمید_تراژیدیانەی خۆش خەیاڵییەکانی ئەم قارەمانانە لەبارەی

دەسکەوتەکانیان و لەگەڵ خودی ئەم دەسکەوتانەدا بە روونی پیشان بدەین، دەبێت واوەتر لە ئاسۆی سنورەکانی ئەڵمانیا بڕوانینە سەرجەم دیمەنەکە.*

[1]

## ئایدیۆلۆژی بەشێوەیەکی گشتی، ئایدیۆلۆژی ئەڵمانی بە شێوەیەکی تایبەت

ڕەخنەی ئەڵمانی، تا ئەم هەوڵانەی دوایشی، هەرگیز قەڵەمڕەوی فەلسەفەی تێنەپەڕاندووە. ئەم ڕەخنانە هەرگیز لە گریمانە فەلسەفییە گشتییەکانی خۆی ناکۆڵێتەوە، بەڵام لەڕاستیدا سەرجەم گرفتەکانی ئەو لەسیستەمێکی فەلسەفی دیاریکراوەوە، سیستەمی فەلسەفی هیگل، سەرچاوە دەگرێت. نەك تەنیا

* – [ لەنوسخەی یەکەمی پاکنوسەکەدا بەشێکی بەدوادا دێت کەخەتی بەسەردا هاتووە:]

بەم پێیە ئێمە پێشەکی لەسەر ڕەخنە دیاریکراوەکانی نوێنەرە جیاوازەکانی ئەم بزووتنەوەیە، چەند تێبینییەکی گشتی بۆ ڕۆشن کردنەوەی فەرزیاتە ئایدیۆلۆژیە هاوبەشەکانی نێوان هەموو ئەوانە دەهێنینەوە. ئەم تێبینیانە بۆ دەرخستنی ڕوانگەی ڕەخنەگرانەی ئێمە، تائەو شوێنەی کە بۆتێگەیشتن و بۆدەسنیشانکردنی ڕەخنە فەردیەکانی دواتر پێویست دەکات، بەسە. ئێمە ئەم تێبینیانە بەتایبەتی لەبەرامبەر بە فیورباخ دادەنێین چونکە ئەو تەنیا کەسێکە کەلانی کەم پێشڕەوی کردووەو دەتوانرێت کارەکانی ئەو بەنیەت باشییەوە بخرێتە ژێر باسەوە.

1_ئایدیۆلۆژی بەشێوەیەکی گشتی و ئایدیۆلۆژی ئەڵمانی بەشێوەیەکی تایبەت

ئەلف–_ئێمە تەنیا یەك زانستی یەکپارچە دەناسین، زانستی مێژوو. ئینسان دەتوانێت لە دوو لایەنەوە بڕوانێتە مێژوو، وە ئەوە بەمێژووی سروشت و مێژووی ئینسان دابەش بکات. بەڵام ئەم دوو لایەنە جیانابنەوە. مێژووی سروشت و مێژووی ئینسان، تا ئەو شوێنەی کە ئینسان بوونی هەیە بەیەکەوە بەستراون. مێژووی سروشت کە ناوی زانستی سروشتییە، لێرەدا پەیوەندی بەکارەکەی ئێمەوە نییە، بەڵکو دەبێت ئێمە لەمێژووی ئینسان بکۆڵینەوە، لەبەر ئەوەی کە نزیکەی تەواوی ئایدیۆلۆژی بریتییە لەتێگەیشتنێکی شێواوی ئەم مێژووەو یا دابڕینی تەواوەتیە لێی. ئایدیۆلۆژی خۆی یەکێکە لەلایەنەکانی ئەم مێژووە.



وەڵامەکانی، بەڵکوو پرسیارەکانیشی لەژێر سێبەری ئەودا بووە. ئەم خۆبەستنەوەیە بە هیگلەوە بووە هۆی ئەوەی کە هیچ یەکێك لەم ڕەخنەگرە نوێیانە، هەر ئەندازەیەکیش کە ئیدیعای کردبێت هیگلی تێپەڕکردووە، تەنانەت هەوڵێکیشی نەداوە بۆ ڕەخنەگرتنێکی هەمەلایەنە لە سیستەمی هیگلی. لێدوانەکانیان لەدژی هیگل و لەدژی یەکتر، لەم چوارچێوەیەدایە کە هەریەکەیان لایەنێك لە سیستەمی هیگلی دەگرێت و ئەوە لە دژی سەرجەم سیستەمەکە، وەیا لەدژی ئەو لایەنانەی کە بەهۆی ئەوانی ترەوە بەدەستەوە گیراون، بەکار دەهێنێت. لەسەرەتادا ئەوان زاراوە تەواو و نەشێواوەکانی هیگل وەك "جەوهەر" و "خۆ هووشیاری[7]"یان گرت بەدەستەوە، دواتر ئەم زاراوانەیان بە لکاندنی ناوە ناپیرۆزەکانی وەك "جۆر"، "تاقانە" ، "ئینسان[8]" و شتی ترکردە دنیایی.

سەرجەم پەیکەرەی ڕەخنەگرانەی فەلسەفی ئەڵمانی لە شتراوسەوە تا شترنر لە چوارچێوەی ڕەخنەگرتن لە تێگەیشتنە [illegible]یەکاندا وەستاوەتەوە*. ڕەخنەگران لە دینی واقعی و خودی لاهوتیەتەوە دەستیان پێکرد. بەدوای ئەوەدا هووشیاری دینی و مفهومی دینی بە ڕێگای جۆراوجۆر پێناسە کرا. پێشڕەوییان لەمەدا کورت دەبوەوە کە مەفهومە بە ڕواڵەت زاڵەکانی میتاقیزیك ، سیاسی، حقوقی، ئەخلاقی و لەجۆری ئەوانە لەژێر چەمکی مەفهومە دینی و تیئولۆژیکیەکاندا بگونجێنن و هەر بەم پێوانەیەش ڕایگەیەنن کە هووشیاری

* [ ئەم بەشەی ژێرەوە لەدەستنووسەکەدا خەتی بەسەردا هاتووە:] لەگەڵ ئەم ئیدیعایەدا کە ڕزگاریکەری ڕەهای ئینسانە لە هەموو شەڕەکان. دین بەردەوام وەك دووژمنی سەرەکی، وەك هۆکاری کۆتایی هەموو ئەو پەیوەندییانەی کە بۆئەم فەیلەسوفانە ناپەسند بوو ، دەردەبڕاو بەم جۆرەش هەڵوێستی لەبەرامبەر وەردەگیرا.

سیاسی ، حقوقی، ئەخلاقی، هەمان هووشیاری دینی یا تیئولۆژیکە و ئینسانی سیاسی ، حقوقی، ئەخلاقی و عادەتەن "ئینسان"ی دینییە. دەسەڵاتی دین بە پێش مەرج وەردەگیرا. وورده وورده هەرجۆرە پەیوەندییەکی زاڵ، وەکو پەیوەندییە دینییەکان ڕاگەیەندرا و بەیەك عیبادەت، عیبادەتی یاسایی، عیبادەتی دەوڵەت و هتد...شکڵەکەی گۆڕانکاری بەسەردا هات. مەسەلەکان لەهەموو جێگایەکدا مەسەلەی دوگمەکان و باوەڕبوون بوو بە دوگمەکان. جیهان بەشێوەیەکی زۆر حاڵەتێکی پیرۆزی پەیداکرد تا سەرەنجام حەزرەتی بەرزی "قەدیس ماکس"9 توانی بەیەك جار ئەوە بەپیرۆز ڕابگەیەنێت و بەم شێوەیە بەگشتی لەشەڕی ئەو ڕزگاری ببێت.

"هیگلییە کۆنەکان" هەر شتێك کە دادەبەزییە ئاستی چەمکێکی لۆژیکی هیگلی، تێدەگەیشتن. "هیگلییە لاوەکان" هەموو شتێکیان بە گێڕانەوەی ئەوە بۆ تێگەیشتنە دینییەکان وەیا بەڕاگەیاندنی ئەوەی کە بابەتێکی تیئولۆژیکە، دایە بەر ڕەخنە. "هیگلییە لاوەکان" لەگەڵ "هیگلییە کۆنەکان" لە باوەڕبوونیان بە دەسەڵاتداریتی دین، دەسەڵاتداریتی تێگەیشتنەکان، دەسەڵاتداریتی ئەسڵێکی جیهان داگیر لە دنیادا، هاوڕان. جیاوازییەکە لەمەدایە کە لایەنێکیان بەناوی نەگبەتییەوە هێرش دەکەنە سەر ئەو دەسەڵاتداریتییە، لەکاتێکدا لایەنەکەی تر ئەوەیان هەر وەك فەرمانێکی بەرحەق دەپەرست.

لەو شوێنەوە کە "هیگلییە لاوەکان" تێگەیشتنەکان، فکرەکان، لێکدانەوەکان، لەڕاستیدا، سەرجەم بەرهەمەکانی هەست، کەئەوان وەك بوونێکی سەربەخۆ سەیری دەکەن، بە کۆتوبەندە واقعییەکانی ئینسانی دادەنێن. ( ڕێك بەهەمان



شێوە کە "هیگلییە کۆنەکان" ئەوانە بە پەیوەندییە حەقیقییەکانی کۆمەڵگای بەشەری ڕادەگەیەنن )، هەر بۆیە ئاساییە کە دەبێت رێك لەدژی هەمان وەهمەکانی هەست کردن بجەنگن. لەوێوە کە بە گوێرەی خەیاڵاتی "هیگلییە لاوەکان"، پەیوەندی ئینسانەکان، سەرجەم کارەکانیان، کۆتوبەندەکان و رێگرییەکانی ئەوان، بەرهەمی هەستی ئەوانە، هەربۆیە ئەوان منطقیانە ئەم حوکمە ئەخلاقییە دەخەنە بەردەم ئینسانەکان کە هوشیاری ئێستایان بە هووشیارییەکی ئینسانی، ڕەخنەگرانە یان خۆیەتی10 بگۆڕنەوە، تالەم ڕێگایەوە رێگرییەکانیان لابەرن. ئەم خواستی گۆڕینی هووشیارییە بە مانای خواستی لێکدانەوەیەکی جیاوازە لەو دنیایەی کەهەیە، واتە بەڕەسمی ناسینی ئەم دنیایەیە لەڕێگای لێکدانەوەیەکی جیاوازەوە. "هیگلییە لاوەکان" بە پێچەوانەی عیبارەتە "جیهان لەرزێن"ە ئیدیعاییەکانیان، سەرسەخترین خۆپارێزەرانن. دواترینیشیان بە ڕاگەیاندنی ئەوەی کە تەنیا لەدژی "عیبارەتەکان" دەجەنگن، بەیانێکی تەواویان بۆ وەسفی چالاکیەکانیان دەست کەوتووە. ئەوان فەرامۆشی دەکەن کە خۆیان شتێکی جیا لەعیبارەتەکان ناخەنە بەرامبەر عیبارەتەکان، فەرامۆشی دەکەن کە تەنیا بەتێکۆشان لەدژی عیبارەتەکانی ئەم دنیایە، بە هیچ جۆرێك لەدژی خودی ئەم دنیا واقعیەی کە هەیە ناجەنگن. تەنیا ئەنجامێك کە ئەم ڕەخنەگرتنە فەلسەفییە توانیویەتی دەستی پێڕابگات، هەندێك ڕۆشنگەری (ئەویش یەك لایەنە) لەبارەی مەسیحیەت لە ڕوانگەی مێژووی دینەوە بووە. دوا دەربڕینەکانی ئەوان جیا لە هەڵبەستییە ئیدیعایەکانیان بەوەی کە بەو ڕۆشنگەرییە بێ نرخانە، دۆزینەوەیەکی گرنگی جیهانی_مێژوویان هیناوەتە دی، هیچی تر نییە.

بەمێشکی هیچ یەکێکیش لەم فەیلەسوفانەدا نەهاتووە، کە بە لێکۆڵینەوە لەبارەی پەیوەندی نێوان فەلسەفەی ئەڵمانیو واقعیەتی ئەڵمانیا، پەیوەندییەکانی نێوان ڕەخنەی ئەوانو دەوروبەری ماددییان لێك بدەنەوە.[ا]

## [ 2ـ پێش مەرجەکانی ناسینی ماددیانەی مێژوو][ب] 11

ئەو پێش مەرجانەی کە ئێمە لێیانەوە دەست پێدەکەین ئارەزوومەندانە نین، دوگم نین، بەڵکوو فەرزیاتێکی واقعین کە تەنیا لە خەیاڵدا دەکرێ وەلابنرێن. ئەم پێش مەرجانە بریتین لە کەسە واقعیەکان، چالاکییەکانیان و هەلومەرجی ماددی ژیانیان، چ ئەو هەلومەرجەی تائێستا هەیەو ئەو هەلومەرجەی کە لەگەڵ چالاکییەکانی خۆیاندا پێکی دەهێنن. هەر بۆیە دەتوانرێت باشیو خراپی ئەم پێش مەرجانە بەڕێگایەکی تەواو ئەزموونی بخرێتە ژێر باسەوە.

یەکەمین پێش مەرجی سەرجەم مێژووی ئینسانی، بێ گومان بوونی کەسانی زیندووی ئینسانییە.* لەبەر ئەوە یەکەمین واقعیەتێك کە دەبێت لێی بکۆڵدرێتەوە پێکهاتی بەدەنی ئەم کەسانەو لەئەنجامدا پەیوەندییەکانی ئەوانە لەگەڵ سەرجەم

ا ـ پاشماوەی ئەم لاپەڕەیە لەدەستنووسەکەدا نییە. بەشێك کە لەلاپەڕەی دواتری دەسنووسەکەدا دێت، لێرەدا لەبەشی 3 دا دانراوە. (ڕ)

ب ـ دەقی بەشێك کە لەخوارەوە دێت لەیەکەم پاکنووس کراوەکە وەرگێراوە.( ڕ)

*ـ[ ئەم پارچەی ژێرەوە لەدەسنووسەکەدا خەتی بەسەردا هاتووە:] یەکەمین کاری **مێژوویی** ئەم فەردانە کە لە ئاژەڵەکانیان جیا دەکاتەوە ئەمە نی‌یە کە ئەوانە بیر دەکەنەوە، بەڵکوو ئەمەیە کە ئەوانە دەست دەکەن بە ***بەرهەمهێنانی ئامرازەکانی بژێوی خۆیان***.



سروشتدا. بێگومان ئێمە لێرەدا نەئەتوانین بچینە ناو[ باسی ] سروشتی جسمانی واقعی ئینسانو نە بچینە ناو [باسی] هەلومەرجێکی سروشتی کە ئینسان خۆی لەودا پەیدا دەبێت ـ وەك زەوی ناسی، ئاوناسی، هیدرۆگرافیك، هەلومەرجی ئاوچەیی‌و هتد ـ**. دەبێت میژوونووس لەم بنەما سروشتییەو گۆڕینی ئەوانە لەلایەن کاری ئینسانەکانەوە لەڕەوتی مێژوودا، دەست پێبکات.

دەتوانرێت ئینسانەکان لەسەر بنەمای هەست، دین و یان هەر شتێکی ترکە ئارەزووی بکەیت، لە ئاژەڵەکانی جیابکەیتەوە. ئەوان خۆیان تەنیا بەوەی کە دەست دەکەن بە بەرهەمهێنانی ئامرازەکانی بژێوی خۆیان، جیابوونەوەی خۆیان لە ئاژەڵەکان دەست پێدەکەن ـ وئەمە هەنگاوێکە کە لەلایەن پێکهاتی بەدەنی ئەوانەوە دیاریدەکرێت. ئینسانەکان لەگەڵ بەرهەمهێنانی ئامرازەکانی بژێویاندا، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ژیانی ماددی خۆیشیان بەرهەم دەهێنن.

شێوەیەك کە ئینسانەکان لە ڕێگای ئەوەوە ئامرازەکانی بژێوی خۆیان بەرهەم دەهێنن لەپێش هەموو شتێکەوە بەستراوەتەوە بەچەندو چۆنی ئامرازەکانی بژێوییەوە کە ئەوانە بەکردەوەو زیندووانە پەیدای دەکەنو دەبێت دووبارە بەرهەمی بهێننەوە.

ئەم شێوە بەرهەمهێنانە نابێت تەنیا بەدووبارە بەرهەمهێنانەوەی بوونی فیزیکی کەسەکان وەربگیرێت. چونکە ئەمە شکلێکی دیاریکراوی چالاکی ئەم

** ـ[ ئەم پارچەیەی خوارەوە لە دەسنووسەکەدا خەتی بەسەردا هاتووە:] ئەم هەلومەرجانە نەك تەنیا ڕێکخستنی سەرەتایی و خۆبەخۆیی ئینسانەکان، بەتایبەتی جیاوازییە ڕەگەزییەکان بەڵکو سەرجەم پێشڕەوی وە یا پێشڕەوی نەکردنی دواتری ئینسانەکان تا ئەگات بە ئێستا دیاریدەکەن.

کەسانە، شکڵێکی دیاریکرا و لەدەربڕینی ژیان، شێوەیەکی ژیانی دیاریکراوە لەلایەن ئەوانەوە. لەبەرئەوەی ئینسانەکان دەژین کەواتە هەن. لەبەرئەوە ئەمەی کەچین، لەگەڵ بەرهەمهێنانیاندا هەم بەوەی کە چی بەرهەم دەهێنن و هەم ئەوەی کەبەچ جۆرێك بەرهەم دەهێنن، یەك دەگرێتەوە. بەم پێیە ئەوەی کە کەسەکان چین، بەستراوەتەوە بە هەلومەرجی ماددی بەرهەمهێنانی ئەوانەوە.

ئەم بەرهەمهێنانە تەنیا لەگەڵ زیادبوونی دانیشتواندا دەردەکەوێت. ئەم کارە بەگوێرەی خۆی پێویستی بە ئاڵوگۆڕی کەسەکانە لەگەڵ یەکتریدا. شێوەی ئەم ئاڵوگۆڕەش لەلایەن بەرهەمهێنانەوە دیاریدەکرێت.

## [ 3 ـ بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕ، 12 دابەشبوونی کار و شێوەکانی خاوەندارێتی: تایەفەیی، کۆن، فیودالی ]

پەیوەندی نەتەوە جیاوازەکان لەگەڵ یەکتریدا بەستراوەتەوە بەوەوە کە کامەیان و تا چ ئاستێك هێزەکانی بەرهەمهێنانی خۆیان، دابەش بوونی کار و ئاڵوگۆڕە نێوخۆییەکانیان تا چ ئاستێك گەشە پێداوە. ئەم ڕایە بەگشتی بەڕەسمی ناسراوە. بەڵام نەك تەنیا پەیوەندییەکانی نەتەوەیەك لەگەڵ ئەوانی تردا، بەڵکوو سەرجەم پێکهاتی ناوخۆیی خودی ئەو نەتەوەیەش بەستراوەتەوە بە قۆناغی گەشەسەندنی بەرهەمهێنانەکەیی و ئاڵوگۆڕە دەرەکی و ناوخۆییەکەیەوە. ئەوەی کە هێزەکانی بەرهەمهێنانی نەتەوەیەك تاچەند گەشەیان کردووە، پێش



هەمووشتێك خۆی لەڕێژەی پێشرەوی دابەشبوونی کاردا دەردەخات. هەر هێزێکی بەرهەمهێنەری نوێ، تا ئەوشوێنەی کەتەنیا فراوانبوونێکی چەندایەتی هێزەکانی بەرهەمهێنانی پێشوو نەبێت کە تائێستا ناسراوە (بۆنموونە کێڵانی زەوییە نوێکان)، گەشەکردنی زیاتری دابەشبوونی کار بەشوێن خۆیدا دەهێنێت.

دابەشبوونی کار لە ناوخۆی نەتەوەیەکدا سەرەتا جیابوونەوەی کاری پیشەسازی و بازرگانی لە کاری کشتوکاڵی و بەم شێوەیە جیایی شار و لادێ و بەرەو ڕووبوونەوەی بەرژەوەندییەکانی ئەوانی بەدواوە دەبێت. گەشەکردنی زیاتری ئەو بەرەو جیایی کاری پیشەسازی لە کاری بازرگانی دەڕوات. لەهەمان کاتدا بە هۆی دابەشبوونی کار لەناو خودی ڕشتە جۆراوجۆرەکاندا، لەنێوان کەسانێکدا کە بۆئەنجامدانی جۆرێکی دیاریکرا و لەکار هاوکاری یەکتر دەکەن، دابەشبوونی جۆراوجۆریش دێنە دی. شێوەی ڕێکخستنی کار لە کشتوکاڵ، پیشەسازی و بازرگانی ( باوك سالاری، کۆیلەیەتی، ڕشتەکان، چینەکان) جێگا و شوێنی نسبی هەریەك لەم گروپانە دیاریدەکات. هەمان هەلومەرج (بەفەرزیەتی ئاڵوگۆڕێکی گەشەکردووتر ) لە پەیوەندییەکانی نێوان نەتەوەکان لەگەڵ یەکتریدا دەبینرێت.

قۆناغە جۆراوجۆرەکانی گەشەکردنی دابەشبوونی کار لەهەمان کاتدا شێوە جۆراوجۆرەکانی خاوەندارێتیشە، بە مانایەکی تر بوونی هەر قۆناغێك لەدابەشبوونی کار، پەیوەندی کەسەکان لەگەڵ یەکتریدا لەڕووی بەرژەوەندییەکان و ئامرازو ئەنجامی کاریشەوە دیاریدەکەن.

یەکەمین شێوەی خاوەندارێتی، خاوەندارێتی تایەفەییە. ئەم جۆرە خاوەندارێتییە لەگەڵ قۆناغی گەشە نەکردوویی بەرهەمهێناندا یەك دەگرێتەوە کە تیایدا خێڵێك لەڕێگای ڕاو و ڕاوەماسی، لەڕێگای بەخێوکردنی ئاژەڵ و لەباشترین حاڵەتدا لەڕێگای کشتوکاڵەوە گوزەران دەکەن. لەبارەی دواتریانەوە ئەم شێوە خاوەندارێتییە پێویستی بەپارچە زەوییە فراوانە نەکێڵدراوەکانە. دابەشبوونی کار لەم قۆناغەدا هێشتا زۆر سەرەتاییە و بەستراوەتەوە بەفراوانبوونی زیاتری دابەشبوونی کاری سروشتیەوە کە لە خێزاندا هەیە. پێکهاتە کۆمەڵایەتیەکەیشی، بەم هۆیەوە، تەنیا جۆرێکی درێژکراوەی خێزانە: سەرۆکە باوك سالارەکان، ئەندامانی تایەفە کە لەژێر دەستی ئەواندان و سەرەنجام کۆیلەکان. کۆیلەیەتی شاراوەی ناو خێزان وورده وورده لەگەڵ زیادبوونی دانیشتوان، زۆربوونی داخوازییەکان و لەگەڵ پەرەسەندنی ئاڵوگۆڕی دەرەکی، چ لەڕێگای شەڕ و چ لەدانوستانەوە گەشە دەکات.

دووەمین شێوە، خاوەندارێتی کۆنی هاوبەش و دەوڵەتییە کەبەتایبەت بەهۆی یەکێتی چەند تایەفەیەکەوە بە وێنەی شارێك، بەهۆی ڕێکەوتن یان زاڵبوون، دەهاتەدی و بەهەمان شێوە کۆیلەیەتی لەگەڵدایە. لەپاڵ خاوەندارێتی هاوبەشدا ئێمە لێرەدا خاوەندارێتی تایبەتی گوێزراوە و دواتر نەگوێزراوەمان هەیە کەلەحاڵی گەشەکردندایە، بەڵام هەروەك شێوەیەکی ناهەموار کە لەژێر خاوەندارێتی هاوبەشدایە. هاوولاتیان تەنیا لەکۆمەڵی خۆیاندا دەسەلاتیان بەسەر کۆیلە ئیشکەرەکانی خۆیانەوە هەیە و تەنانەت تەنیا بەم دەلیلە بەستراونەتەوە بەجۆری خاوەندارێتی هاوبەشەوە. ئەمەش خاوەندارێتی تایبەتی



هاوبەشی هاوولاتیانی چالاك پێك دەهێنێت کە لە پەیوەند بەکۆیلەکانیانەوە، ناچار بەمانەوەی ئەم جۆرە هاوپشتییە خۆبەخۆییە بوون. هەر بەهۆی ئەمەوە سەرجەم پێکهاتی کۆمەڵایەتی پێکهاتوو لەسەر ئەم خاوەندارێتییە هاوبەشە و لەگەڵ ئەودا دەسەلاتی خەڵك، هەر بەو ئەندازەیەی کە خاوەندارێتی تایبەتی نەگوێزراوە گەشە دەکات، لەبەریەك هەڵدەوەشێ. دابەشبوونی کار ئێستا زیاتر گەشەی کردووە. ناکۆکی شارو لادێ تاهەمان ئاست خۆی دەرخستووە. دواتر ناکۆکی نێوان ئەو دەوڵەتانەی کە بەرژەوەندیەکانی شارو ئەو دەوڵەتانەی کە بەرژەوەندییەکانی لادێ نوێنەرایەتی دەکەن، وە لەناوخۆی شارەکاندا ناکۆکی نێوان پیشەسازی و بازرگانی و دەریایی دەردەکەوێت. پەیوەندییە چینایەتییەکانی نێوان هاوولاتیان و کۆیلەکان ئێستا ئیتر بە تەواوی جێگیر بووە.

لەگەڵ گەشەکردنی خاوەندارێتی تایبەتیدا ئێمە بۆ یەکەمین جار لەگەڵ هەمان ئەو پەیوەندییانەدا بەرەو ڕوو دەبینەوە کەجارێکی تر لەئایندەدا، دواجار لەئاستێکی بەرفراوان تردا، لەگەڵ خاوەندارێتی تایبەتی نوێدا بەرەو ڕووی دەبینەوە. لەلایەکەوە چەقبەستنی خاوەندارێتی تایبەتی کە ( هەر بەو جۆرەی کە یاسای زەوی لیسین دەیسەلمێنێ) زۆر زوو لەڕۆمدا دەستی پێکرد و لەکاتی شەڕە ناوخۆییەکان و بەتایبەتی لەژێر دەسەلاتدارێتی ئیمپراتۆرەکاندا زۆر بە خێرایی گەشەی کرد[13] و لەلایەکی ترەوە، هاوکات لەگەڵ ئەودا گۆڕینی جوتیارانی بچوکی پلبین [14]بە پڕۆلیتاریایەك کە بە هۆی جێگا و ڕێگا نێوەنجیەکەی خۆیەوە

لە نێوان ها وولاّتیانی دارا و کۆیلەکاندا هەرگیز گەشەیەکی سەربەخۆی بەدەست نەهێنا .

سێیەمین شێوە، خاوەندارێتی فیودالی یا ڕشتەییە. ئەگەر سەردەمی کۆن لە شار و قەڵەمڕەوی بچوکی ئەوەوە سەریدەرهێنا ، سەدەکانی ناوەڕاست لە لادێوە دەستی پێکرد. ئەم خاڵە جیاوازە مەزنە لە چەندایەتی دانیشتوانی ئەوکات، کە لە ناوچەیەکی بەرفراواندا بلاّوببوونەوەو لەلایەن داگیرکەرانیشەوە هیچ زیادبوونێکی فراوانی نەدەچووە سەر، سەریهەڵدا. بەم پێیە گەشەکردنی فیودالی، بە پێچەوانەی یۆنان و ڕۆم، لەگەڵ زەوی و زارێکی چەندقات فراوانتردا دەست پێدەکات کە لە ڕێگای داگیرکردنەکانی ڕۆم و بە فراوانبوونی کشتوکاڵ، کە لە سەرەتادا لەگەڵ ئەم داگیر کردنانەدا هاوکات بوون، فەراهەم ببوو. سەدەکانی دواتر ئیمپراتۆری ڕوو بە ڕۆچووی ڕۆم و داگیرکردنی ئەو بەدەستی بەربەریەکان بەشێکی بەرچاوی هێزەکانی بەرهەمهێنانی لەناو برد. کشتوکاڵ بەرەو داتەپین ڕۆیی بوو ، پیشەسازی بەهۆی نەبوونی بازاڕ لەبەریەك هەڵوەشابوەوە، بازرگانی لەناوچوو یا بەتووندی شیرازەکەی لەبەر یەك ترازابوو، دانیشتوانی شارو لادێ کەم ببوونەوە. ئەم هەلومەرج و شێوەیاسا و سیستەمی داگیرکەران کەلەوەوە سەرچاوەی دەگرت، هاوکات لەگەڵ نفوزی یاسا سەربازییەکانی ژەرمەنیدا، بووە هۆی گەشەکردنی خاوەندارێتی فیودالی. ئەم جۆرە خاوەندارێتییەش ، هەروەك خاوەندارێتی تایەفەیی و خاوەندارێتی هاوبەش ، لەسەر بنەمای کۆمەڵ بوونێك ڕاوەستاوە، بەلاّم چینی بەرهەمهێنەری ڕاستەوخۆ کەدەکەوێتە بەرامبەریەوە، بەپێچەوانەی لای کۆمەڵی کۆن، کۆیلەکان نین، بەڵکوو جووتیارانی بچوکن



کەگۆڕاون بە ڕەعیەت. هەر لەگەڵ ئەوەی کە فیودالیزم بەشێوەیەکی گشتی گەشەدەکات، قین لەبەری لەگەڵ شارەکانیشدا سەر هەڵئەدات. پێکهاتی زنجیرە پلەو پایەی خاوەندارێتی زەوی و دەزگای بەکرێگیراوی چەکداری پەیوەست بەوەوە، لەبەرامبەر ڕەعیەتەکاندا، هێزی دەدایە خانەدانەکان. ئەم ڕێکخراوە فیودالییە، بەهەمان ئەندازەی خاوەندارێتی هاوبەشی کۆن یەکێتییەك بوو لەدژی چینی بەرهەمهێنەری ژێر دەستە، بەلاّم شێوەی ئەم یەکێتییە و پەیوەندیەکانی لەگەڵ بەرهەمهێنەرە راستەوخۆکانیدا بەهۆی هەلومەرجە جۆرا وجۆرەکانی بەرهەمهێنانەوە جیاواز بوو.

ئەم پێکهاتە فیودالیەی خاوەندارێتی زەوی ها وشێوەی خۆی لە شارەکاندا بەشێوەی خاوەندارێتی ڕشتەیی، ڕێکخستنی فیودالیانەی پیشە، پەیدا دەکرد. لێرەدا خاوەندارێتی بەشێوەیەکی گشتی بریتی بوو لەکاری هەرکەسێك. پێویستی بەها وپشتی لەبەرامبەر خانەدانە تالاّنکەرە یەکگرتووەکاندا، پێویستی بەبازاڕە سەرداپۆشراوە هاوبەشەکان، لەسەردەمێکدا کەخاوەن پیشەکان خۆیان بازرگانیش بوون، ململانێی ڕوو لەسەری ڕەعیەتە هەلاّتووەکان کە شالاّویان دەکردە سەر شارە گەشەکردوەکان، پێکهاتی فیودالی سەرجەم ولاّت: ئەمانە دەستا و دەست ڕشتەکانیان پێکهێنا . سەرمایەی بچوك و بەشێنەیی پاشەکەوت کراوەی پیشەسازە تاکەکان و ژمارەی نەگۆڕی ئەم پیشەوەرانە، لەبەرامبەر چوونەسەری ژمارەی دانیشتواندا، پەیوەندی کرێکاری شارەزا15و شاگردی گەشەپێدا و لەشارەکاندا زنجیرە پلەوپایەیەکی وەك لادێی پێکهێنا .

بەم شێوەیە خاوەندارێتی لە دەورەی فیودالیدا بەگشتی لەلایەکەوە لە خاوەندارێتی زەوی لەگەڵ کاری رەعیەتەکانی پەیوەست پێوەی و لەلایەکی ترەوە لەکاری شەخسی کەسەکان کە بە سەرمایەی بچوکی خۆی دەستی گرتبوو بەسەر کاری کرێکارانی شارەزای پیشەکاندا، پێک دەهات. هەردوو رێکخراوەکانیان ملکەچی هەلومەرجی بەرتەسکی بەرهەمهێنان – واتە چاندنێکی کەم و سەرەتایی زەوی و پیشەسازی دەستی – بوو. لە دەورانی رەونەقی فیودالیزمدا دابەشبوونی کار شتێکی وانەبوو. هەر وڵاتێک لەنا وخۆیدا ناکۆکی شارو لادێی تیادا هەبوو. دابەشبوون بۆ بەشەکان [ی کۆمەڵایەتی] بێگومان بەگشتی دیاریکراوبوو، بەڵام جیا لە لە جیاوازییەکانی شازادەکان، خانەدانەکان، رۆحانییەکان و جووتیاران لە لادێ و وەستاکان، کرێکارانی شارەزای پیشەکان و دواتر جەماوەرێکی کرێکارانی لێرە و لەوێ لەشارەکان، هیچ جۆرە کاردابەشبوونێکی گرنگ بوونی نەبوو. لە کشتوکاڵدا، سیستەمی کشتوکاڵی بچووک، کە پیشەسازی ناومالی خودی جووتیاران لە پاڵ ئەودا پەیدابوو، [ پێشکەوتنی] دابەشبوونی کاری ئاڵۆز دەکرد. لە پیشەسازیدا لە پیشە جیاوازەکاندا دابەشبوونی کار بوونی نەبوو و لەنێوان ئەم پیشانەشدا دابەشبوونیکار زۆر کەم بوو. جیایی پیشەسازیو بازرگانی لە شارە کۆنەکاندا هەبوو. لە شارە نوێکانی دواتردا، کاتێک کە شارەکان پەیوەندیان لەگەڵ یەکتریدا پەیداکرد، گەشەی کرد.

لەدەوری یەک کۆبوونەوەی دەسەڵاتە فراوانترەکان بەشێوەی سەڵتەنەتە فیودالییەکان، بۆ خانەدانە خاوەن زەوییەکان، هەروەها بۆ شارەکانیش،



پێویستییەک بوو. بەم پێیە رێکخراوی چینی دەسەڵاتدار، واتە خانەدانەکان، لەهەموو شوێنێکدا لەسەرووی خۆیەوە پاشایەکی هەبوو.[ت]

## [4 ] ـ بنەمای ناسینی ماددیانەی مێژوو. بوونی کۆمەڵایەتی و هووشیاری کۆمەڵایەتی ]

کەواتە واقعیەت ئەمەیە کە کەسە دیاریکراوەکان کە بەشێوەیەکی دیاریکراو لەبەرهەمهێناندا چالاکن*، دێنە نا و ئەم پەیوەندییە دیاریکراوە کۆمەڵایەتی و سیاسییانەوە. تێڕوانینێکی ئەزموونی بۆهەر بابەتێک بەجیا دەبێت لە رێگای ئەزموونەوە و بەبێ هیچ جۆرە نهێنی ئامێزو گومان کردنێک، پەیوەندییەکانی پێکهاتی کۆمەڵایەتیو سیاسی لەگەڵ بەرهەمهێناندا دەربخات. پێکهاتی کۆمەڵایەتی و دەوڵەت هەمیشە لە هەناوی رەوەندی ژیانی کەسە دیاریکراوەکانەوە سەر دەردەهێنێ و گەشە دەکات، بەڵام نەک بەو جۆرەی کە ئەم کەسانە لەوانەیە لە خەیاڵی خۆیان یان کەسانی تردا دەرکەون، بەڵکوو بەوجۆرەی کە بە واقعی هەن، واتە بەوجۆرەی کە کار دەکەن، بەشێوەیەکی

---

[ت] –پاشماوەی ئەم لاپەڕە لە دەسنووسەکەدا بەتاڵە. لاپەڕەی دواتر بە کورتەیەکی تێگەیشتنی ماددیانەی مێژوو دەست پێدەکات. قۆناغە ئەسڵیەکانی گەشەی چوارەمین جۆری خاوەندارێتی، واتە خاوەندارێتی بورژوازی، کە لەبەشی چوارەمی ئەم فصلە، لەبەندی 3_4دا دێت. (ڕ)

* _[دەسنووسە ئەسڵەکە ئەمەی تیادایە:] کەسە دیاریکراوەکانی ژێر هەلومەرجی دیاریکراوی بەرهەم هێنان.

ماددی بەرهەم دەهێنن، وەهەروەها لەژێر محدودیەتە ماددییەکان و پێش فەرزەکان و هەلومەرجە دیاریکراوەکاندا کە بەدەرن لەئیرادەی ئەو کار دەکەن*.

بەرهەمهێنانی فکرەکان، تێگەیشتنەکان، هووشیاری، هەر لەسەرەتاوە بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەگەڵ هەڵسورانی ماددی و ئاڵوگۆڕە ماددییە ئینسانیەکان واتە زمانی ژیانی واقعیدا بەیەکەوە گرێ دراون. تێگەیشتن، بیرکردنەوە، ئاڵوگۆڕی زەینی ئینسانەکان، لەم قۆناغەدا هێشتا وەك چۆڕینەوەی ڕاستەوخۆی کرداری ماددی ئەوان دەردەکەوێت. هەر ئەمەش لەبارەی بەرهەمهێنانی زەینی نەتەوەیەك، بەوجۆرەی کە لەزمانی سیاسەت، یاساکان، ئەخلاق، دین، میتافیزیك و... هتددا بەیان دەکرێت ڕاستە. ئینسانەکان، ئینسانە چالاکە واقعیەکان کەلەلایەن گەشەی دیاریکراوی هێزەکانی بەرهەمهێنانی خۆیان و ئەو ئاڵوگۆڕەی لەگەڵ ئەواندا دەگونجێت، تادواجۆری لەقاڵب دەدرێن، هەمان ئینسانە بەرهەمهێنەرەکانی تێگەیشتنەکان، فکرەکان و بەشەکانی خودی

* _[ ئەم پارچەیەی خوارەوە لەدەسنووسەکەدا خەتی بەسەردا هاتووە:] ئەو فکرانەی کە ئەم کەسانە دروستی دەکەن، ئەو فکرانەن یا دەربارەی پەیوەندی ئەوان لەگەڵ سروشت، یا دەربارەی پەیوەندییە دوولایەنەکانیان یا دەربارەی سروشتی خودی ئەوانە. ئاشکرایە کە لەهەموو ئەم حاڵەتانەدا فکرەکانی ئەوان بەیانی هووشیاری _ واقیعی یا وەهمی _ پەیوەندییەکان و چالاکییە واقعیەکانی ئەوان، بەرهەم هێنانی ئەوان، ئاڵوگۆڕەکانی ئەوان و شێوە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی ئەوانە. فەرزی پێچەوانەی ئەمە تەنیا لەشێوەیەکدا مومکینە کە سەرباری ڕۆحی کەسە واقعیەکان کە بەشێوەیەکی ماددی گەشەیان کردووە، ڕۆحێکی جیاواز بەپێش فەرز وەربگرن . ئەگەر بەیانی هووشیارانەی پەیوەندییە واقعیەکانی ئەم کەسانە وەهمیانەیە،ئەگەر ئەوان لەخەیاڵی خۆیاندا واقیعیەت هەڵدەگێڕنەوە، ئەمەش بەنۆرەی خۆی بەرەنجامی شێوەی بەرتەسکی چالاکیە ماددییەکانی ئەوان و پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی بەرتەسکە کە لەوەوە سەرهەڵئەدات.



ئەوەن**. هووشیاری هەرگیز ناتوانێت شتێکی جیا بێت لەبوونێکی هووشیارانە و بوونی ئینسانەکان ڕەوتی ژیانی واقعی ئەوانە. ئەگەر لەتەواوی ئایدیۆلۆژیەکاندا، ئینسانەکان و پەیوەندییەکانیان هەر وەك [وێنەیەکی ناوخۆیی] سندوقی وێنەگرتن بەهەڵگەڕاوەیی دەردەکەون، ئەم دیاردەیە هەرئەوەندە لەڕەوەندی ژیانی مێژوویی ئەوان سەرچاوە دەگرێت هەر وەك هەڵگەڕاوەیی شتەکان لەسەر پەردەی چاوی ڕەوەندی ژیانی بەدەنی ئەوان.

ڕێك بەپێچەوانەی فەلسەفەی ئەڵمانی کە لەئاسمانەوە دادەبەزێتە سەر زەوی، لێرەدا مەسەلەکە بریتییە لەسەرکەوتن لەزەوییەوە بۆئاسمان. بەمانایەکی تر بۆ گەیشتن بەئینسانەکان بەگۆشت و پێستی واقعییەوە، خاڵی سەرەکی ئەو شتە نییە کە ئینسانەکان دەیڵێن، خەیاڵی لێدەکەنەوە، بۆی دەچن، وە ئەوەش نییە کە لەبارەی ئینسانەکانەوە دەگێڕدرێتەوە، بیری لێدەکرێتەوە، خەیاڵی لێدەکرێتەوە، دەهێنرێتە بەر چاو، بەڵکوو خاڵی سەرەکی بریتییە لە ئینسانە چالاکە واقعیەکان و پیشاندانی گەشەو کاردانەوە و ڕەنگ دانەوەی ئایدیۆلۆژی ئەوان لەسەر بنەمای ڕەوەندی ژیانی واقعی ئەوان. ئەو وەهمانەش کەلەمێشکی ئینسانەکاندا پێك دێت، بەناچار شێوەیەکی دەرکەوتووی ڕەوەندی ژیانی ماددی ئەوانە کەبەشێوەیەکی ئەزموونی شایەنی لێکۆڵینەوەیەو وابەستەیە بەپێش مەرجە ماددییەکانەوە. بەم شێوەیە ئەخلاق، دین، میتافیزیك و دوا [ شێوەی] ئایدیۆلۆژی و هەروەها شکڵە هووشیارییەکانی هاوتای ئەو ئیتر شێوەی ڕواڵەتی

** –[ دەسنووسە ئەسڵەکە ئەمەی تێدایە:] ئینسانەکان بەرهەمهێنەرانی تێگەیشتنەکان، فکرەکان و لەمانەی خۆیانن، بەڵام ڕێك ئەوئینسانانەی کە لەلایەن شێوەی بەرهەمهێنانی ژیانی ماددیانەوە، لەلایەن ئاڵوگۆڕە ماددی و گەشەکردنەکانی دواتریانەوە لەپێکهاتی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا مەرجدار دەبێتەوە.

سەربەخۆی خۆیان لەدەست دەدەن. ئەوانە مێژوویان نییە، گەشەکردنیان نییە، بەڵکوو ئینسانەکان، ئەو ئینسانانەی کەبەرهەمهێنانی ماددیو ئالوگۆڕی ماددییان گەشە پێئەدەن، شان بەشانی ئەوە دنیای واقعی خۆیانو بیرکردنەوەی خۆیانو بەرەنجامەکانی ئەم بیرکردنەوەیەش دەگۆڕن. ئەمە هووشیاری نییە کەژیان دیاریدەکات، بەڵکوو ئەمە ژیانە کە هووشیاری دیاریدەکات. لەشێوەی هەڵوێسستی یەکەم دا، خاڵی سەرەکی هووشیارییەکە کە وەك فەردی زیندوو وەردەگیرێت. لەشێوەی هەڵوێستی دووەم دا، لەگەڵ ژیانی واقعیدا دێتەوە، خاڵی سەرەکی خودی کەسە زیندووەکانەو هووشیاری رێك وەك هووشیاری لەبەر چاو دەگیرێت.

ئەم شێوە هەڵوێست گرتنە بێ فەرزیات نییە، لەفەرزیاتە واقعییەکانەوە دەست پێدەکاتو تەنانەت ئەوانە بۆ یەك سات بەجێ ناهێڵێت. پێش فەرزەکانی ئەو ئینسانانەن، بەڵام نەك لەگۆشەگیری یا لەدوگمێکی خەیاڵیدا، بەڵکوو لەژێر هەلومەرجێکی دیاریکراو لەپرۆسەی دەرخستنی واقعیو لەڕووی ئەزموونیەوە شایەنی ناسین. بەتەنیا هەرکە ئەم ڕەوەندی چالاکی ژیانە شی بکرێتەوە، ئیتر مێژوو نەك کۆمەڵێك لە فاکتە بێ گیانەکان دەبێت، بەو جۆرەی کەلای ئیمپریسیستەکانە (کەهێشتا خۆشیان تەجریدین)، و نەهەڵسوڕانی خەیاڵی ژاتە خەیاڵیەکان دەبێت، بەو جۆرەی کە لای ئایدیالیستەکانە.

ئەو کاتەی کە گومان کردنەکان کۆتاییان پێدێت، ئەو کاتەی کە ژیانی واقعی دەست پێدەکات، سەرەنجام ، زانستی مثبتی واقعی، شیکردنەوەی هەڵسوڕانی عەمەلی، شیکردنەوەی پرۆسەی بەکردەوەی فراوانبوونو گەشەکردنی ئینسانەکان



دەستپێدەکات. عیبارەتە پووچەکان دەربارەی هووشیاری کۆتاییان پێدێتو دەبێت مەعریفەی واقعی جێگایان بگرێتەوە. کاتێك واقعیەت شیکرایەوە، فەلسەفەی خۆپەسند هۆیەکانی بوونی خۆی لەدەست ئەدات. لەباشترین حاڵەتدا جێگای ئەو تەنیا کۆبەندییەکی گشتیترین ئەنجامەکان، ئەو تجریدانەی کە لەبینینی دۆزینەوە مێژووییەکانی ئینسانەکانەوە وەردەگیرێ، دەتوانێت بیگرێتەوە. ئەم داپڕاندنانە لەخۆیاندا، جیا لەمێژووی واقعی، هیچ جۆرە بەهایەکیان نییە. ئەوانە تەنیا ئەتوانن رێکخستنی کەرەسەو بەرژەوەندییە مێژووییەکان ئاسان بکەنو خزمەتی دەرکەوتنی بەشە جیاجیا و یەك لەدوای یەکەکان بکەن. بەڵام بەهیچ جۆرێك ناتوانێت وەك فەلسەفە، نوسخە یان نەخشەیەك بێت بۆ رێکوپێککردنی دەورانە مێژووییەکان. بەپێچەوانەوە، دژواریەکان رێك لەوێوە دەستپێدەکەن کە کەسێك دەست بکات بەکاری لێکۆڵینەوەو رێکخستنی کەرەسەکان، چ پەیوەست بێت بەدەورانی ڕابردوو، چ پەیوەست بێت بەدەورانی ئێستا، وە بەکردەوە ئەوە بخاتەروو. لابردنی ئەم دژواریانە بەستراونەتەوە بەو فەرزیاتانەوە کە بێگومان ناوبردنیان لێرەدا لەتوانادا نییە، بەڵکو تەنیا لێکۆڵینەوەی ڕەوەندی ژیانی واقعی و هەڵسوڕانی کەسەکان لەهەر دەورانێکدا ئەوانە دەردەخات. ئێمە لێرەدا هەندێك لەم داپڕاندنانە، کە بۆ جیاکردنەوە و بەرامبەرکێ لەگەڵ ئایدیۆلۆژیدا بەکاری دەهێنین، هەڵدەبژێرین و ئەوانە لەگەڵ نموونە مێژووییەکاندا رۆشن دەکەینەوە.

## [ II ]

## [1_ پێشمەرجە واقعییەکانی ئازادی ئینسان ]

بێگومـان ئێمـە زەحمـەتی ئەمـە هـەڵناگرین کـە ئـەوە بـۆ فەیەسـوفە بـیر وردەکانمـان ڕوونکەینـەوە کـە "ئـازادی" "ئینسـان" بـەگۆڕینی فەلسـەفە، لاهوتیەت، جەوهەرو هەموو ئەم وڕێنانـە بـە "خـۆ هوو شیاری" و ئـازادکردنی "ئینسـان" لەدەسـەڵاتی ئـەم عیبارەتانـە، کـە هیـچ کـات ئـەویان نەخسـتۆتە ناڕەحەتییەوە، تەنانەت هەنگاوێکیش بەرەوپێشەوە ناڕوات* . ئەوەشیان بۆ ڕوون ناکەینەوە کە گەیشتن بە ئازادی واقعی تەنیا لەدنیای واقعیو لەڕێگای واقعییەوە مەیسەر دەبێت، کە کۆیلەیەتی ناتوانێت بەبێ ماتۆڕی هەڵم و ئامێری چنین لەکار بخرێ و ڕەعیەت نـاتوانێت بـەبێ کشـتوکاڵی پێشـکەوتوو هەڵبوەشـێتەوە، بە شـێوەیەکی گشـتی لەبـەر ئـەوەی کەخـەڵك نـاتوانن خـواردن و خواردنـەوە، خانووبەرەو جلو بەرگیان بە چەندی و چۆنیەتیەکی تەواوەوە دەست بکەوێت، ناتوانن ئازاد بن. "ئازادی" کارێکی مێژوویییە نەك زەینی، وە لـە هەلومـەرجی مێژوویـی، ئاسـتی پیشەسـازی، بازرگـانی، کشـتوکاڵ و ئاڵوگۆڕکردنـەوە دێتەدەستج. دواتر بەسیفەتی ئـەم کـارە ئینسـانەکان، یەکانگیر لەگـەڵ قۆناغە جیاوازەکـانی گەشـەکردنیان، پوچیەکانی جەوهـەر، بابـەت، خۆهوو شـیاری و ڕەخنەی ڕووت، بەهەمان شێوە کە پووچیەکانی دینیو لاهوتیەت پێك دەهێنن، و دواتـر لـەکاتێکدا کـە بەئەندازەیـەکی تـەواو بـەرەو پێشـەوە چـوون، لەکۆتوپێوەندەکانی ئەمانەش ڕزگاریان دەبێـت* . لەئـەڵمانیا، وڵاتێـك کـە تـەنیا

---

*_[ نووسینی پەراوێزلەلایەن مارکس:] ئازادی فەلسەفیو ئازادی واقیعی، –ئینسان، تاقانـە، فەرد–هەلومەرجی زەوی ناسی، هایدرۆگرافیك و هتد . لەشی ئینسان . پێویستیەکانو کار .

ج– دەستنووسەکە لێرەدا شێواوە: خوارەوەی وەرەقەکە دڕاوە، دێڕێك وونە.



گەشەیەکی کەمی مێژوویی تیادا ڕوو ئەدات، ئەم دۆزینەوە زەینیانە، ئەم فکرە دوو ڕووەو بریقە دارانە، بەڵام بێقەبارەو بێ ئەهمیەت، بێگومان جێگای نەبوونی گەشەی مێژوویی دەگرنەوە، ڕیشە دائەکوتن و دەبێت خەباتیان لـەدژ بکرێـت. بەڵام ئەم خەباتە گرنگیەکی ناوچەیی هەیە.**

## [ 2_ ماتەریالیزمی سەیرکەرانەو نەنسجیمی فیورباخ ] 16

ح لەڕاستیداو بۆ ماتەریالیزمی پراتیك ، واتە کۆمۆنیست، مەسەلەکە بریتییە لـە ژێـرەو ژوور کردنـەوەی ئـەم جیهانـەی کەهەیـە، لەدەسـتبردن و گۆڕینـی بەکردەوەی ئـەو واقعیەتـەی کەهەیـە. جارجـارێك کـە ئێمـە بـەرەو ڕووی ئـەم تێڕوانینانـە لـەلای فیورباخ دەبینەوە دەبینین کە هیچ کاتێك لـە پـێزانینێکی پەرتەوازانە زیاتر ناڕۆن و کاریگەریشیان لەسەر ڕوانگەی گشتی ئەو لەوە کەمترە کە بتوانێت ئەوانە وەك بە شێك لـەو خانانـەی شـایەنی فراوانبوونـن وەربگـیرێن. "تێگەیشتنی"ی فیورباخ لەدنیای هەست پێکراو لەلایەك بەبینینی رووتی ئەو و لەلایەکی ترەوە بەهەست پێکردنی رووتی ئەوەوە قەتیس دەبێتەوە. ئەو "ئینسان بە شێوەیەکی گشتی" دەخاتە جێگای "ئینسانی واقعی مێژوویی". ئەم "ئینسان بە شێوەیەکی گشتی"یە لەڕاستیدا "فەردی ئەڵمانی" یە. لەحاڵەتی یەکەم دا، واتە بینینی دنیای هەست پێکراو ، ئەو جار ناجارە بەرەو ڕووی ئەو شتانە دەبێتەوە کە لەگەڵ هوو شیاریو هەستەکانی ئەودا ناکۆکە و هاوئاهەنگییەك کە ئـەو بە پێش فەرز وەریدەگرێت، هاوئاهەنگی نێوان سەرجەم بەشەکانی دنیای هەسـت پێکراو و بەتایبەتی نێوان ئینسانو سروشت تێکدەدات* . ئەو بۆ نەهێشتنی ئەم ناڕێکییە دەبێت پەنا بەرێتە بەر تێگەیشتنێکی دوولایەنە، یەکیان تێگەیشتنێکی دنیایی کە "تەنیا بەدیهیاتە ئاساییەکان"و تێگەیشتنێکی بالاتری فەلسەفی کە

---

* –[ نووسینی پەراوێزلەلایەن مارکس:] زمان، زمانی واقیعیەتە .

* –پێنج لاپەڕەی دەسنووسەکە وونە. (ڕ)

"زاتی حەقیقی" شتەکان تێدەگات. ئەو ئاگای لەوە نییە کە دنیای هەست پێکراوی دەوروبەری ئەو شتێك نییە کە بەبێ هۆلەئەزەلەوە پەیدا بووبێت و بەردەوام وەك یەك بمێنێتەوە، بەڵکوو بەرهەمی پیشەسازیو وەزعی کۆمەڵگایە. وتە لەڕاستیدا بەرهەمێکی مێژووییە، بەرەنجامی چالاکی نەوە یەك لەدوای یەکەکانە کە هەر یەکەیان لەسەر شانی نەوەکانی پێشووتر ڕاوەستاوە، پیشەسازیو ئاڵوگۆڕەکەی گەشە پێئەدات و سیستەمە کۆمەڵایەتیەکەی لەسەر بنەمای پێویستیە گۆڕاوەکان چاك دەکات. تەنانەت ئەو شتانەی کە سادەترین "قطعیەتی هەستکردن" یان هەیە تەنیا لەڕێگای گەشەکردنی کۆمەڵایەتی، پیشەسازی و ئاڵوگۆڕی بازرگانییەوە بەو دراوە. درەختی گێلاس، وەك زۆربەی درەختەکانی میوە، هەر وەك دەیزانین، هەمان چەند سەدەیەك پێشتر لەڕێگای بازرگانییەوە هێنراوەتە ناوچەکەی ئێمەو ڕوێنراوە و بەم پێیە تەنیا لەلایەن ئەم کارەوە کۆمەڵگایەکی دیاریکراو لەدەورەیەکی دیاریکراودا بۆ فیورباخ بووە بە "قطعیەتی هەستکردن".

بەهەرحاڵ، کاتێك شتەکان بەمشێوەیە، وتە بەو جۆرەی کە بە ڕاستی هەن و ڕوویان داوە، ببینرێن، هەر کێشەیەکی قووڵی فەلسەفی، بەو شێوەیەی کە دواتر ڕۆشنترلێی وورد دەبینەوە، بەسادەییەکی تەواوە وەبە شێوەی واقعیەتێکی ئەزمونی حەل دەبێت. بۆ نموونە، مەسەلەی گرنگی پەیوەندی ئینسان لەگەڵ سروشتدا (برۆنۆتائەو جێییە دەڕوات کە قسە لە "ناکۆکی نێوان سروشت و مێژوو" دەکات، کە گوایە ئەوانە دوو "شتی" جیاوازن و ئینسان هەمیشە سروشتێکی مێژوویی و مێژوویەکی سروشتی بەخۆیانەوە نەبینیوە)، کە سەرچاوەی سەرجەم ئەم "لەرهەمە بێپرادە بەرزانە 17" دەگەڕێتەوە بۆ "جەوهەر" و "خۆ هوو شیاری"، خۆبەخۆ رۆ دەچێتە خوار، هەر کاتێك ئێمە تێگەیشتین کەئەم "یەکێتی"یە ناسراوەی "ئینسان و سروشت" هەمیشە لەپیشەسازیدا هەبووەو لەهەر دەورانێکدا بەگوێرەی گەشەکردنی کەمتر یان زیاتری پیشەسازی



لە شکڵە جۆراوجۆرەکانیدا هەبووەو بەهەمان جۆر کێشمەکێشی ئینسان لەگەڵ سروشتدا، ڕێك هاوکات لەگەڵ گەشەی هێزەکانی بەرهەمهێنانی بە شەردا بەبەردەوامی هەبووە. پیشەسازیو بازرگانی، بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕی پێویستییەکانی ژیان، بەگوێرەی خۆی دابەشبوون، [ و هەروەها ] پێکهاتی چینە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان دیاریدەکەن و بە گوێرەی خۆی بەپێی شێوەیەك کە کاری پێدەکەن، لەژێر کاریگەری ئەودا دەبن. وە بەمجۆرەیە کە فیورباخ بۆنموونە لە منچستر تەنیا کارگەکان و ئامێرەکان دەبینێت، جێگایەك کە سەد ساڵ پێشتر لەودا تەنیا چەرخی دوورینو دەزگای چنین دەبینرا، یا لە کامپانیادی ڕۆما18 تەنیا لەوەڕگاکان و گۆمەکانی دەستدەکەوێت، لەحاڵێکدا کە لەکاتی ئەگوستۆسدا19، لەوێ بێجگە لە شوێنی باخ و ڤیلاکانی سەرمایەدارانی ڕۆم شتێکیان دەست نەدەکەوت. فیورباخ بەتایبەتی قسە لەتێگەیشتنەکانی زانستی سروشتی دەکات، ئەو ئەونهێنیانە دەخاتەوە یاد کەتەنیا بەچاوی فیزیاییەکان و کیمیاگەرەکان دەردەکەوێت، بەڵام بەبێ پیشەسازی و بازرگانی زانستە سروشتییەکان لەکوێدا دەتوانرا هەبن؟ تەنانەت ئەم زانستە سروشتییە "ڕووت" ئەش ئامانجی خۆی، هەر وەك بەرژەوەندییەکانی، تەنیا لەڕێگای پیشەسازی وبازرگانی، لەڕێگای چالاکی هەستپێکراوی ئینسانەکانەوە دەستدەکەوێت. ئەم چالاکییە، ئەم کارو داهێنانە بەردەوامەی هەست پێکراو، ئەم بەرهەمهێنانە، ئەم بنەماییەی سەرجەم دنیای هەستپێکراو بە شێوەیەك کە ئێستا هەیە، ئەوەندە زۆرە کە ئەگەر تەنیا ماوەی یەك ساڵ تووشی ڕاوەستان ببێت، فیورباخ نەتەنیا گۆڕانکارییەکی مەزنی لەدنیای سروشتدا دەبینی، بەڵکوو بەزوویی تێدەگەیشت کە سەرجەم جیهانی ئینسانی و توانای تێگەیشتنی خۆیشی، بەڵکوو زیاتر لەمەش خودی خۆیشی، لەناودەچێت. بێگومان لێرەدا پێشکەوتنی سروشتی دەرەکی لەجێگای خۆیدا دەمایەوەو ئەم هەموو ڕاستگۆییە لەبارەی ئینسانە سەرەتاییەکانەوە کە بە زایینی خۆبەخۆیی

هاتوونەتە دی، نییە. بەڵکوو ئەم جیاوازییانانە تائەو شوێنە مانای هەیە کەئینسان بە جیاواز لەسروشت لەبەرچاو دەگیرێت. بەدەر لەمە، سروشت، سروشتی پێش مێژووی ئینسانی، بەهیچ شێوەیەك ئەو سروشتە نییە کە فیورباخی تیا دەژی، ئەمە سروشتێکە کە ئیتر لە هیچ شوێنێکدا بوونی نییە (ڕەنگە بێجگە لەبە شێکی دوورگەی مەرجانی ئوسترالیا کەتازە سەریهەڵداوە) و بەم شێوەیە بۆ فیورباخیش بوونی نییە.

بێگومان فیورباخ گەلێك زیاتر لەسەرووی ماتەریالیستە "خالص"ەکانەوەیە، چونکە ئەو پەی بەوەدەبات کە ئینسانیش یەك "بابەت بۆ هەستکردن"ە. بەڵام جیا لەمەی کەئەو ئینسان تەنیا وەك یەك "بابەت بۆ هەستکردن"، نەك یەك "چالاکی هەستپێکراو" دادەنێ، لەو شوێنەوە کەئەو هێشتا لەقاڵەمڕەوی تیۆریدا دەمێنێتەوە و ئینسانەکان لەپەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو، لەژێر هەلومەرجی ژیانییان، کە ئەوانی گۆڕیوە بەو شتەی کە هەن، نابینێ، هەربۆیە هیچ کاتێك ناگاتە ئینسانە چالاکەکان، بەڵکوو لەدابڕاندنی "ئینسان"دا ڕادەوەستێ و لەناسینەوەی عاطفی "ئینسانی بەدەنی، هەردی و واقعی" زیاتر تێنا پەڕێت، بەمانایەکیتر ئەو هیچ جۆرە "پەیوەندی ئینسانی" "نێوان ئینسان و ئینسان"، بێجگە لە عیشق و خۆشەویستی ناناسێت و تەنانەت ئەمەش بە شێوەیەکی ئایدیالیانە تێدەگات. ئەو هیچ ڕەخنەیەك لەهەلومەرجی ئێستای ژیان نادات بەدەستەوە. بەم شێوەیە ئەو هەرگیز ناتوانێت جیهانی هەست پێکراو وەك چالاکی زیندووی هەستکردنی تەواوی کەسەکان کە ئەوە پێك دەهێنێت، ببینێت. بەم پێیە کاتێك کە ئەو، بۆنموونە لەجێگای ئینسانە ساغەکان کۆمەڵێك برسی بەراز ئاسایی و لەکارکەوتوو و سیلاویانە دەبینێ، ناچارە کە پەنا بەرێتە بەر "تێگەیشتنی بەرز" و ئیدە داتاشین لە "قەرەبووکردنەوەی جۆرەکان" و بەم شێوەیە دووبارە ڕووبکاتەوە ئایدیالیزم، ڕێك لەجێگایەکدا کە ماتەریالیستی



کۆمۆنیست، پێویستی و لەهەمان کاتدا هەلومەرجی گۆڕین، هەم لەپیشەسازی و هەم لەپێکهاتە کۆمەڵایەتییەکاندا دەبینێت.

فیورباخ لەو شوێنەدا کە ماتەریالیستە ناچێتە سەر مێژوو، وەلەو شوێنەدا کە دەڕوانێتە مێژوو ماتەریالیست نییە. ماتەریالیزم و مێژوو لای ئەو بەگشتی لەیەك جیادەبنەوە، ئەو واقعیەتەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە لەسەرەوە باسمان کرد.*

[ 3_ پەیوەندییە مێژووییە بنەڕەتییەکان،
یاخود بنەڕەتییەکانی چالاکی کۆمەڵایەتی:
بەرهەمهێنانی ئامرازەکانی بژێوی، بەرهەمهێنانی پێویستییە نوێکان،
بەرهەمهێنانەوەی ئینسانەکان (خێزان)، ئاڵوگۆڕی کۆمەڵایەتی، هوشیاری]

*لەو شوێنەوە کە ئێمە سەروکارمان لەگەڵ ئەڵمانیەکاندا هەیە کە بەبێ هەرزیاتن، دەبێت لەیەکەمین هەرزیاتەکانی تەواوی ئینسانی و بەم پێیە تەواوی مێژووەوە دەستپێبیکەین، واتە ئەم فەرزەی کە ئینسانەکان دەبێت بتوانن بژین تابتوانن "مێژوو پێکبهێنن". بەڵام ژیان لەپێش هەموو شتێکەوە پێویستی بە دابینکردنی خواردن و خواردنەوە، خانوو، جلوبەرگ و سەرجەم شتەکانە**.

بەم شێوەیە یەکەمین کاری مێژوویی، بەرهەمهێنانی هۆیەکانی پڕکردنەوەی ئەم پێویستیانە و بەرهەمهێنانی خودی ژیانی مادییە. وە ئەمە لەڕاستیدا کارێکی مێژووییە، مەرجێکی ئەساسی سەرجەم مێژووە کە ئەمڕۆش هەر وەك هەزاران

* -[ ئەم پارچەی ژێرەوە لەدەسنووسەکەدا خەتی بەسەردا هاتووە:] هۆی ئەوەی کە ئێمە لێرەدا بەدوورو درێژییەکی زیاتر مێژوو دەدەینە بەر باس ئەمەیە کە ووشەکانی "مێژوو" و "مێژوویی" لەلایەن ئەڵمانیەکان بەگشتی مانا ئەداتە هەموو شتێك بێجگە لەواقعیەت. نموونەی دەرکەوتووی ئەمە بەتایبەت قەدیس برونۆیە بەو "ڕەوانیە مینبەری"یەکەیەوە.

** –[ نووسینی پەراوێز لەلایەن مارکس] هیگل، هەلومەرجی زەوی ناسی، هایدرۆگرافیك و هتد. بەدەنی ئینسان. پێویستیەکان، کار.

سالّی پێشووتر، دەبێت هەر ڕۆژ و هەر سەعاتە تەنیا بۆمانەوەی ژیانی ئینسانی بەرهەم بهێنرێت. تەنانەت کاتێك جیهانی هەست پێکراو ، وەك لای قەدیس برنۆ، بەلایەنی کەمەوە، تا ئاستی داربەدەستێك دەهێنرێتە خوارەوە، لەم حاڵەتەشدا پێویستی بەکاری بەرهەمهێنانی داربەدەستێکە. بەم پێیە لەهەر جۆرە ناسینێکی مێژوودا کەسەکە دەبێت لەپێش هەموو شتێکەوە ئەم واقعیەتە بنەڕەتییە لەگەڵ سەرجەم مانا و ئەنجامەکانیدا تێبینی بکات و گرنگی قوربانییەکی پێبدات. لای هەموان ئاشکرایە کە ئەڵمانیەکان هەرگیز ئەم کارەیان نەکردووە و بەم پێیە هەرگیز بنەمایەکی زەمینییان بۆ مێژوو، وە لەئەنجام دا مێژوونووسێکیان نییە. فەڕەنساییەکان و ئینگلیزەکان، بەوەی کە پەیوەندی ئەم واقعیەتەیان لەگەڵ بەحساب مێژوودا بە شێوەیەکی بەرزی یەك لایەنە تێگەیشتوون، بەتایبەتی بەهۆی ئەوەی کە ئەوان لەبەندی ئایدیۆلۆژی سیاسیدا ماونەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا یەکەمین هەوڵەکانیان بۆ دانی بنەمایەکی ماتەریالیستی بە مێژووناسی، بەنووسینی یەکەمین مێژووەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، بازرگانی و پیشەسازی، خستە کارەوە.

خاڵی دووەم ئەمەیە کە بەدیهێنانی یەکەمین پێویستی، کاری بەدیهێنان و ئامرازی دەستکەوتنی ئەم پێکهاتەیە بووە هۆی [دروست بوونی] پێویستیە نوێکان و دروستبوونی ئەم پێویستییە نوێیانە یەکەمین کاری مێژووین. لێرەدا ئێمە بێدابڕان ئیجابیاتە مەعنوییەکانی هۆشی گەورەی مێژوویی ئەڵمانیەکان دەناسینەوە کە کاتێك کەرەسە مثبتەکانیان کۆتایی پێدێت و ناتوانن وڕێنە خواوەندییەکان، یان سیاسی و ئەدەبیەکان دروستبکەن، ئیدیعا دەکەن کە لەئەسڵدا ئەمە مێژوو نییە، بەڵکوو "سەردەمی پێش مێژوو"ە، بەبێ ئەوەی کەزەیدی ئێمەیان سەبارەت بەوەی کە بە چ جۆرێك لەم "پێش مێژوو"ە بێمانایە دەگەینە خودی مێژوو ڕۆشن کردبێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان لەلایەکی ترەوە لەگومانکردنە مێژووییەکانیاندا بە ئارەزوویەکی تایبەتەوە دەست لەم "پێش مێژوو"ە گیردەکەن، چونکە لەوێدا خۆیان لە دەست تێوەردان لەلایەن "واقعیەتە کرچەکانەوە" بەپارێزراو دەزانن و هەروەها بەهۆی ئەوەیشەوە کە لەوێدا دەتوانن سایەقەی گومانکردنی خۆیان بە شێوەیەکی گشتی بجەنە جوڵەوە و هەزاران هەزار هەرزییە بەرز بکەنەوە و وێرانی بکەن.

سێیەمین کە هەر لە سەرەتاوە بە شداری لەگەشەی مێژوویدا دەکات، ئەمەیە کە ئەو ئینسانانەی ڕۆژانە خەریکی دروستکردنەوەی ژیانی خۆیانن، بۆ فراوانکردنی جۆری خۆیان دەست دەکەن بەدروستکردنی ئینسانەکانی تر. واتە: پەیوەندی نێوان پیاو و ژن، دایك و باوك و منداڵەکان، خێزان. خێزان کە لە سەرەتادا تەنیا پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتییە، دواتر لەکاتێکدا پێویستیەکانی زۆر بوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە نوێکان و زۆربوونی دانیشتوان، پێویستییە نوێکان دەهێنێتەدی، دەبێتە پەیوەندییەکی ناچاری (بێجگە لە ئەڵمانیا) و بۆیە دەبێت بەگوێرەی ئەو ئەزموونانەی کەهەن و نەك بەو شێوەیەی لە ئەڵمانیادا باوە لەسەر بنەمای "تێگەیشتنی خێزان" بدرێتە بەر باس و لێکۆڵینەوەوە.

بێگومان نابێت ئەم سێ لایەنەی چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان وەك سێ قۆناغی جیاواز لەبەر چاو بگیرێن، بەڵکوو تەنیا وەك سێ لایەن، وەیا بۆئەوەی کە ئەوە بۆ ئەڵمانیەکانی ڕوونکەینەوە، سێ "سات"ن کە لەسپێدەی دەمی مێژوو، وە هاوکاتی [دەرکەوتنی] یەکەمین ئینسانەکان هەبوون و ئەمڕۆش هەر بەو جۆرە لە مێژوودا بوونی خۆیان دەسەپێنن.

بەرهەمهێنانی ژیان، هەم بەرهەمهێنانی ژیانی خودی کەسەکان لەڕێگای کارو هەم بەرهەمهێنانی ژیانی نوێ لەڕێگای بەرهەمهێنانی لەجۆری خۆی، ئێستا وەك پەیوەندییەکی دوولایەنە دێتە پێش چاو: لەلایەکەوە وەك پەیوەندییەکی سروشتی و لەلایەکی ترەوە وەك پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی- کۆمەڵایەتی بەم مانایەی کە پشت دەبەستێت بەهاوکاری کەسە جۆراو جۆرەکان، بە چاوپۆشین لەمەی کە لەژێر چی هەلومەرجێکدا، بە چ شێوەیەك و بۆچی ئامانجێك ڕوو

ئەدات. لێرەدا ئەو جۆرە ئەنجامە وەردەگیرێت کە شێوەیەکی دیاریکراوی بەرهەمهێنان، یا قۆناغێکی پیشەسازی، هەمیشە لەگەڵ شێوەیەکی دیاریکراوی هاوکاری، یا قۆناغێکی کۆمەڵایەتیدا دێن و ئەم شێوە هاوکارییە خۆی یەك "هێزی بەرهەمهێنەر"ە. جیا لەمەش ئەم ئەنجامەش وەردەگیرێت کە کۆی تەواوی هێزە بەرهەمهێنەرەکان لەبەر دەستی ئینسانەکاندا هەلومەرجی کۆمەڵگا دیاریدەکەن، بۆیە "مێژووی بەشەریەت" دەبێت هەمیشە لە پەیوەند بە مێژووی پیشەسازی و ئاڵوگۆڕەوە بخوێندرێتەوەو لێی بکۆڵدرێتەوە. بەلام ئەمەش ڕوونە کە نووسینی ئەم جۆرە مێژووە لە ئەڵمانیادا مومکین نییە، چونکە ئەڵمانیەکان نەتەنیا توانای ناسین و کەرەسەی پێویستی ئەم کارەیان نییە بەڵکوو "قطعیەتی هەستپێکردن"یشیان نییە، لەبەر ئەوەی لەولای ڕاینەوە کەسێك ناتوانێت هیچ جۆرە ئەزموونێکی لەم شتانە هەبێت، چونکە لەوێدا مێژوو وازی لە ڕووداوەکان هێناوە. بەمشێوەیە هەر لە سەرەتادا تەواو ئاشکرایە کەلەنێوان ئینسانەکاندا پەیوەندییەکی مادی لەگەڵ یەکتردا هەیە، کە لەلایەن پێویستیەکانی ئەوان و شێوەکانی بەرهەمهێنانی ئەوانەوە دیاریدەکرێت و ئەوەندەی خودی ئینسانەکان کۆنە. ئەم پەیوەندییە هەمیشە شکڵە نوێکان بەخۆوە دەگرێت و بەمشێوەیە "مێژوو"یەکی سەربەخۆلەبوونی هەر جۆرە هەرایەکی سیاسی یا دینی، کە ئینسانەکان لە ڕێگای تایبەتەوە بەیەکەوە ببەستێتەوە، دەخاتە ڕوو.

ئێستا، لە دوای تێبینی چوار حاڵەت، چوار لایەنی پەیوەندییە بنەڕەتیەکانی مێژوویە کە دەبینین ئینسان خاوەنی "هووشیاری"[*]یشە. بەلام تەنانەت لەهەمان سەرەتایشەوە ئەم هووشیارییە، هووشیارییەکی "ڕووت" نییە. "زەین"لەهەمان سەرەتاوە ئاڵودەی ئەم نەگبەتیەیە کە "باری" مادەی بەسەرەوە بێت، مادەیەك

[*] –[ نووسینی پەراوێز لەلایەن مارکس:] ئینسانەکان مێژوویان هەیە چونکە دەبێت ژیانی خۆیان بەرهەمبهێنن، جیا لەمە بەم هۆیەی کە دەبێت ئەوە بەڕێگایەکی دیاریکراو بەرهەمبهێنن: ئەمە دەبەسرێتەوە بەئۆرگانیزمی بەدەنی ئەوانەوە. هووشیاری ئەوانیش ڕێك لەهەمان ڕێگاوە دیاریدەکرێت.



کەلێرەدا ڕۆڵەتی شەپۆلە تووندەکانی هەوا، دەنگەکان و لەیەك قسەدا زمان دەگرێتە خۆی. زمان ئەوەندەی هووشیاری کۆنە، زمان ئەو هووشیارییە عەمەلییە واقعیەیە کە بۆ ئینسانەکانی تریش بوونی هەیە و تەنیا بەهۆی ئەمەوە بۆ منیش بوونی هەیە. زمان هەروەك هووشیاری، تەنیا لە پێویستی، لەزەرووڕەتی ئاڵوگۆڕکردن لەگەڵ ئینسانەکانی تردا دەردەکەوێت[**]. لەهەر شوێنێکدا کە پەیوەندییەك هەیە، ئەم پەیوەندییە بۆ من هەیە: ئاژەڵ لەگەڵ شتێکدا "پەیوەندی" نابەستێت، ئاژەڵ ئەسڵەن "پەیوەندی" نابەستێت. بۆ ئاژەڵ پەیوەندی ئەو لەگەڵ ئەوانی تردا وەك پەیوەندییەك بوونی نییە. بەم پێیە هووشیاری لەهەمان سەرەتاوە بەرهەمێکی کۆمەڵایەتییە و تا ئەو شوێنەی کە ئسوڵەن ئینسان بوونی هەبێت، بەمشێوەیە دەمێنێتەوە. بێگومان هووشیاری لەسەرەتادا ڕێك هوو شیارییەکی مەربووتە بە چوار دەوری هەستپێکراوی راستەوخۆوەو هووشیاری لە پەیوەندییەکی بەرتەسکدا لەگەڵ کەسەکانی تردا و شتێکی بەدەر لە کەسێکە کە خەریکە خۆهوو شیار دەبێت. لەهەمان حاڵەتدا ئەم هووشیارییە لە سرو شتەوەیە، سرو شتێك کە لە سەرەتادا لەگەڵ ئینسانەکاندا وەك هێزێکی تەواو بێگانە، زۆر بەتواناو خۆڕاگر ڕووبەڕوو دەبێتەوەو پەیوەندی ئینسانەکان لەگەڵ ئەودا ڕێك ئاژەڵییە و هەروەك گیانلەبەرەکان دەکەوێتە ژێر هەیبەتی ئەوەوە. بەمشێوەیە ئەمە هووشیارییەکی ڕێك ئاژەڵییە لەسرو شت (دیدی سرو شتی)، ڕێك بەم هۆیەوەیە کە تائێستا مێژوو گۆڕانکارییەکی وەهای لەسرو شتدا نەکردووە. لەلایەکی ترەوە ئەمە هووشیاری ئینسانەکانە بەوەی پێویستی بەهاوپشتی لەگەڵ کەسەکانی چوار دەوری خۆیدا هەیەو دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ئەو هووشیارییەی کە ئەو لە ئەسڵدا لەکۆمەڵگادا دەژی. ئەم دەستپێکردنە بەهەمان رادەی خودی ژیانی کۆمەڵایەتی لەم قۆناغەدا ئاژەڵییە.

[**] –[ ئەم ووشانەی خوارەوە لەدەسنووسەکەدا خەتیان بەسەردا هاتووە:] پەیوەندی من لەگەڵ دەوروبەرمدا هووشیاری منە.

ئەمە ڕێک هووشیارییەکی مێگەلییە و لەم شوێنەدا ئینسان تەنیا بەم واقعیەتە لەمەڕ جیا دەبێتەوە کە لەلای ئەو هووشیاری جێگای غەریزە دەگرێتەوە یان ئەوەی کە غەریزەی ئەو غەریزەیەکی هووشیارانەیە[*]. ئەم هووشیارییە مەڕییە یا تایەفەییە گۆڕان و فراوان بوونی دواتری خۆی لە داهاتی زیاتر، لە زیادبوونی پێویستییەکان و لەو شتەی بۆ هەر دوو ئەمانە ئەساسین، واتە زۆر بوونی دانیشتوان، بەدەست دێت. شان بە شانی ئەمانە دابەشبوونێکی کار کە لە سەرەتادا بێجگە لە دابەشبوونی کار لە کاری بەدەنی شتێکی تر نییە و دواتر دابەشبوونی کارێک کە بە شێوەیەکی خۆبەخۆیی یا "سروشتی" بەهۆی ئامادەییە سروشتییەکانەوە (بۆ نموونە هێزی بەدەنی)، پێویستییەکان، ڕووداوەکان و هتد... دەردەکەوێت، گەشە دەکات[**]. دابەشبوونی کار تەنیا کاتێک بەڕاستی دەبێتە دابەشبوونی کار کە دابەشبوونی کاری بەدەنی و فکری دەردەکەوێت.[*] لەم حاڵەتە بەدواوە هووشیاری دەتوانێت بەڕاستی شانازی بە خۆیەوە بکات کە شتێکی وەک هووشیارییە بەسەر پراتیکدا، کە بەڕاستی نوێنەرایەتی شتێک دەکات بەبێ ئەوەی کە نوێنەرایەتی شتێکی واقعی کردبێت. لەم ساتە بەدواوە هووشیاری لە جێگا و ڕێگایەکدایە کە خۆی لە جیهان ڕزگار بکات و بەرەو شکڵ پێدانی تیۆری "رووت"، لاهوتیەت، فەلسەفە، ئەخلاق و لە جۆری ئەمانە بڕوات.

---

[*] –[ نووسینی پەراوێز لەلایەن مارکس:] ئێمە لێرەدا بێدابڕان دەبینین کە ئەم مەزهەبی سروشتییە یا ئەم بەرەو ڕووبوونەوە تایبەتە سەبارەت بە سروشت لەلایەن جۆری کۆمەڵگاوە دیاریدەکرێ و بە پێچەوانەوە. لێرەشدا وەک هەموو شتێک ئەم لەیەک چوونەی سروشت و ئینسان بە جۆرێک دەردەکەوێت کە بەرەو ڕووبوونەوەی بەرتەسکی ئینسانە سەبارەت بەسروشت، پەیوەندی محدودی کەسە ئینسانییەکان لەگەڵ یەکتریدا پێکدێنێ و بەرەو ڕووبوونەوەی محدودی ئەوان سەبارەت بەیەکتر پەیوەندی محدودی ئینسان لەگەڵ سروشتدا لەگەڵ خۆیدا دێنێت.

[**] –[نووسینی پەراوێز لەلایەن مارکس کە لەدەسنووسەکەدا خەتی بەسەردا هاتووە:] هووشیاری ئینسان لە ڕەوەندی گەشەی واقیعی مێژوییدا گەشەدەکات.

[*] –[ نووسینی پەراوێز لەلایەن مارکس:] یەکەمین جۆری ئایدیۆلۆژیستەکان، واتە قەشەکان لەم دەورانەدایە.



بەڵام تەنانەت ئەگەر ئەم تیۆری، لاهوتیەت، فەلسەفە، ئەخلاق و شتی تر لەگەڵ پەیوەندییەکاندا دەکەونە ناکۆکییەوە، ئەم کارە تەنیا بەهۆی ئەمەوە دەتوانێت ڕوو بدات کە ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیانەی کە هەن لەگەڵ هێزەکانی بەرهەمهێناندا کەوتوونەتە ناکۆکییەوە. جیا لەمە، ئەم بابەتە لەوانەیە لە پەیوەندییەکان [لە هەندێ شوێنی] حەوزەیەکی نەتەوەیی تایبەتیشدا ڕوو بدات، بەڵام لە ژێر کاریگەری ناکۆکییەک کە لە هەناوی مەداری نەتەوەییەوە سەریان هەڵنەداوە، بەڵکوو [سەرچاوەیان لەبەرەو ڕووبوونەوەی] نێوان ئەم هووشیارییە نەتەوەییە و پراتیکی سەرجەم نەتەوەکاندایە[**]. بە مانایەکی تر لە نێوان هووشیاری نەتەوەیی ئەم نەتەوەوە و هووشیاری گشتی ئەودایە (بەو جۆرەی کە ئێستاش لە ئەڵمانیادا خەریکە ڕوو ئەدات). بەڵام لەو شوێنەوە کە ئەم ناکۆکییە تەنیا دەتوانێت بە شێوەی ناکۆکی لە هووشیاری نەتەوەییدا دەرکەوێت، بەو جۆرە دێتە بەر چاوی ئەم نەتەوانە کە خودی خەباتیش لەم پۆخڵەواتییە نەتەوەیانەدا قەتیس بۆتەوە، ڕێک بەم هۆیەوەیە کە ئەم نەتەوەیە نوێنەرایەتی خودی ئەم پۆخڵەواتیانە دەکات.

لە هەمان کاتدا بەتەواوی وەک یەک وایە کە هووشیاری بۆخۆی دەست بۆ کام کار دەبات: لە نێوان هەموو ئەم پشتگوێ خراوانەدا ئێمە تەنیا کارمان بەو ئەنجامە هەیە کە ئەم سێ حاڵەتە، واتە هێزەکانی بەرهەمهێنان، هەلومەرجی کۆمەڵگا و هووشیاری، دەتوانن و دەبێت لەگەڵ یەکتردا بکەونە ناکۆکییەوە، چونکە دابەشبوونی کار ئەو ئیمکانەی لە خۆگرتووە و بەڵکوو زیاتر لەمەش، ئەم واقعیەتەی لە خۆگرتووە کە چالاکی فکری و بەدەنی[*]، بەهرەمەندی و کار، بەرهەمهێنان و بەکارهێنان، سەپاوە بەسەر کەسە جیاوازەکاندا و ئەوەش کە تەنیا

---

[**] –[نووسینی پەراوێز لەلایەن مارکس:] دینەکان. ئەڵمانییەکان و ئایدیۆلۆژی بەشێوەیەکی گشتی.

[*] –[نووسینی پەراوێز لەلایەن مارکس کە لەدەسنووسەکەدا خەتی بەسەردا هاتووە:] چالاکی و بیرکردنەوە، یا کار بەبێ بیرو بیر بەبێ کار.

ئیمکانی بەناکۆکی نەگەیشتنی ئەوانە بۆ خۆی لەنەمانی دابەشبوونی کاردایە.
جیا لەمە، ئاساییە کە 'تارماییەکان"، "پێوەندەکان"، 'بوونی باڵا"، 'تێگەیشتن"، 'تەهی"، ڕێک بەیانە ئایدیالیستی، خەیاڵی و زەینیەکانن، تێگەیشتنی بە ڕواڵەت مەڕبووت بەکەسە جیاوازەکان، [بەلام لە ڕاستیدا] تەنیا وێنەیەکن لە کۆت و بەندەکان و بەرتەسکییە تەواو ئەزموونیەکان کە شێوەی بەرهەمهێنانی ژیان و شکڵی گونجاوی ئاڵوگۆڕ لەگەڵ ئەودا، لە چوارچێوەی ئەواندا دەچنە پێشەوە.[**]

## [ 4_ دابەشبوونی کۆمەڵایەتی کار و پەیامەکانی : خاوەندارێتی تایبەتی، دەوڵەت، 'نامۆیی" چالاکی کۆمەڵایەتی ]

دابەشبوونی کار کە سەرجەم ئەم ناکۆکیانەی تێ ئاخنراوە و بەگوێرەی خۆیان لەسەر دابەشبوونی کار لە خێزان و جیابوونەوەی کۆمەڵگا بە خێزانە دابڕاوە دژ بەیەکەکان ڕاوەستاوە، لە هەمان کاتدا دابەشکردنی لەخۆگرتووە و لە ڕاستیدا دابەشکردنی نایەکسانانەی کار و بەرهەکانیەتی، چ چەندایەتی و چ چۆنایەتی، وە بەمجۆرە خاوەندارێتییە کە ناوك یا شێوە سەرەتاییەکەی لە خێزاندا هەیە و تیایدا ژن و منداڵەکان کۆیلەی مێردن. ئەم کۆیلایەتییە شاراوەیە لە خێزاندا، گەرچی هێشتا زۆر کاڵ و کرچە، یەکەمین شێوەی خاوەندارێتییە، بەلام تەنانەت لەم قۆناغەدا بەتەواوی لەگەڵ پێناسەی ئابووریناسە نوێکاندا دێتەوە کە خاوەندارێتی بە هێزێك دەزانن کە هێزی کاری ئەوانی‌تر دەخاتە ژێر ڕکێفەوە. هەر

---

[**] –[ ئەم رستەیەی خوارەوە لە دەسنووسەکەدا خەتی بەسەردا هاتووە:] ئەم بەیانە ئایدیالیستییەی بەرتەسکیە ئابوورییە واقعیەکان، نەتەنیا لەلایەن نەزەری ڕووتەوە بەڵکوو لەهووشیاری عەمەلیشدا هەیە، بەمانایەکی تر هووشیارییەك کە خۆی ڕزگاردەکات و لەگەڵ شێوەی بەرهەمهێناندا دەکەوێتە ناکۆکییەوە، نەتەنیا دینەکان و فەلسەفەکان بەڵکوو دەوڵەتەکانیش پێکدێنێت.



چۆنێك بێت، دابەشبوونی کار و خاوەندارێتی تایبەتی زاراوەیەکی مترادیفن: لە یەکێکیاندا شتێك بە گەڕاندنەوە بۆ چالاکی بەیان کراوە، کە لەوی ترییاندا هەمان شت بەگەڕاندنەوە بۆ بەرهەمی چالاکی.

جیا لەمە، هەروەها دابەشبوونی کار بەهەمان جۆر ناکۆکی نێوان بەرژەوەندی کەسە جیاوازەکان یا خێزانە جیاکانی لەگەڵ بەرژەوەندی هاوبەشی سەرجەم ئەو کەسانەی کە لەگەڵ یەکتریشدا ئاڵوگۆڕ دەکەن لەخۆگرتووە. وە لەراستیدا ئەم بەرژەوەندییە هاوبەشە، بەپێچەوانەی 'بەرژەوەندی گشتی" زادەی خەیاڵ نییە، بەڵکو سەرەتا، لە شێوەی بەیەکەوە پەیوەستی دوولایەنەی ئەو کەسانەی کە کاریان لەنێوانیاندا دابەش کراوە، لە واقع بوونی هەیە.[خ]

لەهەناوی خودی ئەم ناکۆکییەی نێوان بەرژەوەندییە تایبەتییەکان و بەرژەوەندییە هاوبەشەکاندا، بەرژەوەندی هاوبەش شێوەیەکی سەربەخۆ بەوێنەی دەوڵەت لەخۆ دەگرێت کەلەبەرژەوەندییە فەردی و کۆمەڵییە واقعییەکان جیا بووەتەوە، شێوەیەك کە لەهەمان کاتدا وەك کۆبوونەوەیەکی نادیار هەمیشە لەسەر بنەمای پەیوەندییە واقعییەکان هەیە و لەهەر تێکەڵاوبوونێکی خێزانی یا تێکەڵاوبوونی تایەفەیی – لە جۆری خزمایەتی خوێنی، زمان، دابەشبوونی کار لەئاستێکی بەفراوانتردا، وەسەرجەم پەیوەندییەکان – راوەستاوە. بەتایبەتی دەوڵەت، هەر بەو جۆرەی کە دواتر ڕوونی دەکەینەوە، لەسەر بنەمای چینەکان راوەستاوە، ئەو چینانەی کە خۆیان لەلایەن دابەشبوونی کارەوە سەریان هەڵداوە و لە هەر کۆمەڵێکی ئینسانی لەم جۆرەدا لەیەك جیادەبنەوە و یەکێك لەوانە زاڵ دەبێت بەسەر ئەوانی تردا. لێرەدا وەها دەردەرکەوێت کە سەرجەمی ئەو خەباتەی کەلە چوارچێوەی دەوڵەتدا ڕوودەدات، خەباتی نێوان دیموکراتی، خانەدانەیی و سەڵتەنەت، خەبات بۆ مافی رادەربڕین و ...هتد، تەنیا ئەو جۆرە

---

[خ] –دوو پەرەگرافەکەی دواتر لە پەراوێزدانووسراون. یەکەمیان لەلایەن ئەنگلس و دووەمیان لەلایەن مارکس. (پ)

نادیارنــەن (بە شـــێوەیەکی گشــتی بـــەرژەوەندی گشــتی شـــێوەی نادیـــاری بەرژەوەندییە هاوبەشەکانە) کەلەواندا خەباتـە واقعیەکانی چینە جیاوازەکـان لەگەڵ یەکتردا دەبرێتە پێشەوە (شتێک کە تیۆریسیـنە ئەڵمانییەکان کەمترین ئاگاییان لێی نییە، گەرچی لەساڵنامەکانی ئەڵمانی – هەرەنسی و خێزانی پیرۆزدا دەروازەیەکی تەواو تایبەتیان لـەم بارەیـەوە دەسـتکەوتووە). جیـا لەمـە ئـەم ئەنجامەش وەردەگیرێت کەهەر چینێک کە بیەوێت زاڵ بێت، تەنانەت لەکاتێکدا دەسەڵاتەکەی ئەو وەك ئەوەی لەبارەی پرۆلیتاریاوە راستە، بەهەڵوەشاندنەوەی هەموو شێوەکانی پێشووی کۆمەڵگا بەتەواوی و هەڵوەشـاندنەوەی دەسـەڵات بە شێوەیەکی گشتی ئەنجام بدرێت، دەبێت سەرەتا دەسەڵاتی سیاسی بەدەستەوە بگرێت. تابەگوێرەی خۆی بەرژەوەندی خۆی وەك بەرژەوەندی گشتی دەرببڕێت، چونکە کە لەسەرەتادا ناچارە ئەم کارە بکات.

رێـک بـەهۆی ئەمـەی کـە کەسـەکان تـەنیا بـەدوای بـەرژەوەندی تایبـەتی خۆیانەوەن کە بـۆ ئـەوان لەگەڵ بەرژەوەندییە هاوبەشەکانیاندا نایەتـەوە، ئـەم بەژەوەندییە هاوبەشە بەلایانەوە هەر وەك بەرژەوەندییەکی "نامۆ"، "سەربەخۆ لەوان و بەگوێرەی خـۆی بە شێوەی بەژەوەندییەکی "گشتی" "تایبەت و جیاواز خۆی دەردەخات. یائەوەی کە ئەوانە دەبێت خۆیان، وەك ئەوەی لەدیموکراتیدا هەیە، لـەم ناسـازییەدا بمێننـەوە. لەلایـەکی تـرەوە خـەباتی بـەکردەوەی ئـەم بەرژەوەندییـە تایبەتـە، کەلەراسـتیدا بـەردەوام لەبەرامبـەر بـە بـەرژەوەندی هاوبەش و بـەرژەوەندی هاوبەشـی نادیـاردا دەجوڵێتـەوە، پێویسـت بەدەسـت تێـوەردان و رێگـری کردەوانـە لەلایـەن بـەرژەوەندی "گشـتی" نادیـار لە شـکڵی دەوڵەت دا، دەکات.

وە دواجار دابە شبوونی کار یەکـەمین نموونـەی ئـەم واقعیەتـە پیشـان ئێمـە ئەدات کە لەبەر ئەوەی ئینسان لەکۆمەڵگایەکدا کە سرو شتیانە گە شەی کـردووە بمێنێتەوە، واتـە لەبـەر ئـەوەی کـە لـەنێوان بـەرژەوەندی تایبـەت و بـەرژەوەندی



گشتیدا قڵشتێك هەیە و هەر بۆیە لەبەر ئەوەی کە چالاکی نەك خوازیارنە بەڵکو بە شێوەیەکی سرو شتی دابە شبووە، کاری خودی ئینسان دەبێتە هێزێکی نامۆی دژ بەخۆی کە لەبری ئەوەی لەژێر دەسەڵاتی ئەودا بێت، ئەو بەرەو کۆیەیەتی راکێشـدەکات. چونکـە تـەنیا بەپـەیدابوونی دابە شـبوونی کـار، هـەر کەسـێك مەیدانێکی هەڵسوڕانی تایبەت و تایبەتمەند بەخۆی پەیدا دەکات کە سەپاوە بەسەریداو نـاتوانێت لێـی رابکات. ئەو راوچـی، ماسـیگر، شـوان، یـا رەخنـە گرێکە و ئەگەر نەیەوێت کە هۆیەکانی پەیداکردنی بژێوی خۆی لەدەست بدات دەبێت چۆن بووە ئاوا بمێنێتەوە. لەکاتێکدا لەکۆمەڵگای کۆمۆنیستیدا، کە لەودا هیچ کەسێك مەیدانێکی چالاکی تایبەت بەخۆی نییە بەڵکو هەر کەسێك دەتوانێت لەهەر شتەیەك کە ئارەزووی دەکـات لێهاتووییەك بەدەسـت بـهێنێت، کۆمـەڵگا بەرهەمهێنانی گشتی رێك دەخات و بەم شێوەیە بۆ من مەیسەر دەکات کە ئەمڕۆ شتێك و بەیانی شتێکیتر ئەنجام بدەم. بەیانییەکەی راوبکەم، لەدوای عەسر ماسی بگرم، ئێوارەش باڵندە بەخێو بکەم، دوای نانخواردنی ئێـوارەش رەخنـە بگرم، بەکورتی بەهەر جۆرێك کە ئارەزووی دەکەم، بـەبێ ئـەوەی هـەرگیز ببمـە راوچی، ماسیگر، شوان یا رەخنەگر.

ئەم راوەستانی چالاکییە کۆمەڵایەتییە، ئەم حوکمـەی کـە ئـەو شتەی ئێمە خۆمان بەرهەمی دەهێنین بە شێوەی هێزێکی مادی سەروخۆمان، بەدەر لە توانای ئێمە، کە ئارەزووەکانی ئێمە دەکاتە نەقشی سەر ئاو و حساباتەکانی ئێمە دەکاتە هیـچ، تائێسـتا یەکێك بـووە لـەهۆکارە سـەرەکییەکانی گە شەی مێـژوو[د]. هـێزی کۆمەڵایەتی، واتە هێزی بەرهەمهێنەری چەند قات زیادکراو، کە بەهاوکاری کەسە جیاوازەکان بەهۆی دابە شبوونی کارەوە سەرچاوە دەگرێـت، لـەو شـوێنەوە کـە هاوکاری کەسەکان ئارەزوانە نەبووە بەڵکو بە شێوەیەکی سرو شتی هاتۆتەدی، بۆ

[د] -مارکس لێرەدا لەپەراوێزدا بەشێکی زیاد کردووە کەلەم چاپەدا وەك دوو پەرەگرافی بەشـی (5) هاتووە.(پ)

ئەوان نەك بە شێوەی دەسەلاتی یەکگرتووی خۆیان، بەڵکو هەر وەك هێزێکی نامۆ کە لە دەرەوەی ئەوان هەیە دەردەکەوێت، هێزێك کە ئەوان ئاگایان لەسەرچاوەو ئامانجەکەی نییە و بەم شێوەیە ئیتر توانای کۆنترۆڵ کردنیان نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە سەربەخۆ لەئیرادەو کاری ئینسان بە ریزێك دەوران و قۆناغە نەناسراوەکاندا تێدەپەڕێت و لەوەش زیاتر تەنانەت فەرمانڕەوایی ئەسڵی ئەم ئیرادەو کارەیە. بەدەر لەم شێوەیە بە چ جۆرێك دەکرا خاوەنداریێتی لەئەسڵدا مێژوویەکی هەبووبێت، شێوەی جۆراو جۆر بەخۆوە بگرێت و خاوەنداریێتی زەوی، بۆ نموونە، لەسەر حسابی هەرزیاتە جیاوازەکان لە فەڕەنسا لەوردە خاوەنداریێتییەوە بۆ چەقبەستنی خاوەنداریێتی لە دەستی ژمارەیەکی کەم و لەئینگلستان لە چەقبەستنی خاوەنداریێتی لە دەستی ژمارەیەکی کەم بۆ وردە خاوەنداریێتی پێشکەوتوو بە شێوەیەك کە ئەمڕۆ بە واقعی هەیە، دەرهاتبێت؟ یان بە چ جۆرێك مومکینە کە بازرگانی، کە شتێکی زیاتر لەئاڵوگۆڕی بەرهەمی کەسەکان و وڵاتە جۆراوجۆرەکان نییە، لەرێگای پەیوەندی دەرخستن و داواکارییەوە دەسەلاتی بەسەرتەواوی جیهاندا هەبێت. -پەیوەندییەك کە بەقسەی ئابووری ناسێکی ئینگلیزی هەر وەك قەدەرێك لەسەردەمی کۆندا لەئاسمانی سەر زەوی راوەستاوەو بەدەستێکی نەبینراوەوە خۆشبەختی و نەهامەتی بەنسیب ئینسانەکان دەکات، ئیمپراتۆرەکان دادەمەزرێنێت و لەناویان دەبات، دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی نەتەوەکان و یالەسەر لاپەڕەی رۆژگار دەیانسڕێتەوە؟ لەکاتێکدا بە هەڵوەشاندنەوەی بنەماکەی، واتە خاوەنداریێتی تایبەتی، لەگەڵ رێکخستنی کۆمۆنیستی بەرهەمهێناندا (و لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی بەرەو رووبوونەوەی نامۆیانەی ئینسانەکان بەبەرهەمەکانی خۆیان، کە لەودا شاراوەیە) دەسەلاتی پەیوەندی دەرخستن و داواکاری دەبێتە هیچ و ئینسانەکان جارێکیتر توانای ئاڵوگۆڕ، بەرهەمهێنان و جێگا و رێگای هەڵسوکەوتەکانیان لەگەڵ یەکتردا بەدەستەوە دەگرنەوە.



## [5- گەشەکردنی هێزەکانی بەرهەمهێنان وەك پێشمەرجێکی ماددی کۆمۆنیزم]

ئەم 'نامۆبوونە" (بۆ ئەوەی کە زاراوەیەکمان بەکارهێنابێت کە بۆ فەیلەسوفەکان شایەنی تێگەیشتن بێت)، بێگومان تەنیا بە بوونی دوو پێش مەرجی عەمەلی دەتوانرێت هەڵبوەشێتەوە. بۆ ئەوەی کە ببێتە هێزێکی 'تەحەمول نەکراو" واتە ببێتە هێزێك کە ئینسانەکان لە دژی ئەو شۆڕش دەکەن، بەناچاری دەبێت جەماوەری مەزنی بەشەریەتی 'بێ خاوەنداریێتی" کردبێت، وە سەرباری ئەوە لەگەڵ دنیای مەزنی سامان و فەرهەنگ دا کەوتبێتە ناکۆکییەوە. هەر دوو ئەم فەرزیاتانە پێویستی بەزۆر بوونێکی گەورە لەتوانای بەرهەمهێنان و ئاستێکی بەرزلە گەشەکردنی ئەوی هەیە. وەلەلایەکی ترەوە ئەم گەشەکردنەی هێزەکانی بەرهەمهێنان (کە لەهەمان کاتدا لەخۆگری بوونی ئەزموونی بەکردەوەی ئینسانەکانە لە بوونێکی مێژوویی – جیهانیدا، نەك ناوچەیی ئەوان)، پێش مەرجێکی عەمەلی بێ ئەم لاولا پێویستە، چونکە بەبێ ئەوە تەنیا بێ بەشیو پێویستی، زاڵ دەبێ و سەرلەنوێ پێویستی خەبات بۆ پێویستیەکان بەدەستەوە دەگیرێتەوەو هەموو ئەو کارە گەندەڵانە دووبارە دەگەڕێنەوە. ئەم گەشەکردنە بەم دەلیلەش پێویستە کە تەنیا بەم گەشەکردنە جیهانییەی هێزەکانی بەرهەمهێنانە کە ئاڵوگۆڕی جیهانی لە نێوان ئینسانەکاندا پێکدێت، ئاڵوگۆڕێك کە لەلایەکەوە لە هەموو نەتەوەکاندا بە شێوەیەکی هاوکات دیاردەی جەماوەری 'بێ خاوەنداریێتی" بەرهەم دەهێنێ (ململانێی جیهانی) و هەر نەتەوەیەك دەبەستێتەوەبە شۆڕشی نەتەوەکانی تر و لە دواجاردا کەسانی مێژوویی-جیهانی، بە ئەزموونی جیهانییەوە دەخاتە جێی کەسە ناوچەییەکان. بەبێ ئەم [گەشەی جیهانی هێزەکانی بەرهەمهێنان]، (1) کۆمۆنیزم تەنیا دەیتوانی وەك دیاردەیەکی ناوچەیی بوونی هەبێت، (2)هێزەکانی ئاڵوگۆڕ خۆیان نەیان ئەتوانی وەك هێزە

جیهانی‌یەكان و لەم رووەوە ناچارانە، گەشە بكەن. بەڵكوو "هەلومەرجی" خۆیی و ئاخنراو بە خورافەكان دەمایەوەو (3)هەر فراوانبوونێكی ئاڵوگۆڕ، كۆمۆنیزمی ناوچەیی لەناودەبرد. لە رووی ئەزموونییەوە كۆمۆنیزم تەنیا بە شێوەی كاری هاوكات و "هەموو لەیەك كات"ی نەتەوە زاڵەكان، كە پێویستی بە گەشەی جیهانی هێزەكانی بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕە جیهانییەكانەوە هەیە، ئیمكانی هەیە.*

سەرباری ئەمە، [بوونی] جەماوەرێكی كرێكار كە بێجگە لە كرێكار شتێكیتر نین – واتە [بوونی] هێزێكی كار لە ئاستێكی جەماوەریدا كە لەسەرمایە یان تەنانەت لە بەدەستهێنانی كەمی پێویستیەكانی خۆی بێبەش بووەو بەهۆی ململانێوە دووچاری هەلومەرجێكی تەواو نادڵنیایی بووە، وەها هەلومەرجێك كە ئیتر لە دەستدانی سەرچاوەی دڵنیایی ژیان واتە كار لەودا تەنیا مەسەلەیەكی كاتی نییە، [بوونی ئەم جەماوەرە كرێكارانە]، پێش مەرجی [بوونی] بازاڕی جیهانییە. بەم جۆرە پڕۆلیتاریا تەنیا دەتوانێت بە شێوەی مێژوویی – جیهانی بوونی هەبێت، هەر وەك چۆن چالاكی ئەو، واتە كۆمۆنیزم، تەنیا دەتوانێت بوونێكی "مێژوویی – جیهانی" هەبێت. بوونی مێژوویی – جیهانی كەسەكان، واتە بوونی كەسانێك كە راستەوخۆ لەگەڵ مێژووی جیهانیدا بەیەكەوە بەستراون.

كۆمۆنیزم بۆ ئێمە هەلومەرجێك نییە كە دەبێت دامەزرێت، فكرەیەك نییە كە دەبێت واقعیەت خۆی لەگەڵدا بگونجێنێت. ئێمەئەو بزووتنەوە واقعییە ناو دەنێین كۆمۆنیزم كە هەلومەرجی ئێستا هەڵدەوەشێنێتەوە. هەلومەرجی ئەم بزووتنەوەیە لەو فەرزیاتانەوە سەرچاوە دەگرێت كە هەر ئێستا هەن.[ژ]

*                    *                    *

* – [لەسەرەوەی درێژەی ئەم بەشە كە لەلاپەڕەی دەستنووسەكەدا دێت. ماركس نووسیویەتی:] كۆمۆنیزم.

[ژ] –ئەم پەرەگرافە لەدەستنووسەكەدا لەجێگایەكی بەتاڵی سەرەوەی پەرەگرافێكدا كەبەووشەكانی ئەم "ئامۆ بوون"ە دەست پێدەكات، لەلایەن ماركسەوە نوسراوە (ڕ)



ئەم شێوە ئاڵوگۆڕەی كە لە لایەن هێزەكانی بەرهەمهێنانەوە لە هەموو قۆناغە مێژووییەكانی رابردوودا دیاریدەكرێت و بەگوێرەی خۆی دیاریكەری ئەوانە، كۆمەڵگای مەدەنییە. پێش مەرج و بنەمای كۆمەڵگای مەدەنی، هەر بەو جۆرەی كە ئێمە لەسەرەوە دەربارەی ئەمە قسەمان كرد، روون دەبێتەوە، خێزان و خێزانی لەیەكدراو، ناسراو بە تایەفەیەو پێناسەی وورتری ئەم كۆمەڵگایە لە تێبینییەكانی سەرەوەی ئێمەدا هاتووە. هەر لێرەدا ئێمە دەبینین كە ئەم كۆمەڵگا مەدەنییە ناوەند و مەیدانی رووداوی حەقیقی تەواوی مێژووەو تێگەیشتنی تائێستای مێژوو، كە پەیوەندییە واقعییەكان نابینێ و خۆی بە روداوە بەرجەستە مێژوویەكانەوە قەتیس دەكات، تا چ ئەندازەیەك پووچە.

ئێمە تائێستا بە شێوەیەكی هەڕەمەكی لە چالاكی ئینسانیدا یەك لایەنە، نوێ كردنەوەی سەروسیمادانی سروشتمان بەدەستی ئینسان تێبینی كردووە... لایەنێكیتر سەر لەنوێ ئارایشتدانەوەی ئینسانە لەلایەن ئینسانەوە.*

سەرهەڵدانی دەوڵەت و پەیوەندی دەوڵەت بەكۆمەڵگای مەدەنییەوە.[ڕ]

## 6_ئەنجامی بینینی ماتەریالیستی مێژوو :
## مێژوو وەك پرۆسەیەكی بەردەوام،
## مێژوو لە گۆڕانیدا بە مێژووی جیهانی،
## پێویستی شۆڕشی كۆمۆنیستی]

مێژوو شتێكی جیا لەبەردەوامی نەوە جیاوازەكان نییە كە هەر یەك لەوانە سوود لەكەرەسەكان، زەخیرە سەرمایییەكان و هێزە بەرهەمهێنەرەكان، كە لە لایەن نەوەكانی پێشترەوە گەیشتۆتە دەستی ئەو، وەردەگرێت و بەم شێوەیە لە لایەكەوە

* – [نووسینی پەراوێز لەلایەن ماركس:] ئاڵوگۆڕو توانای بەرهەمهێنان.

[ڕ] –كۆتایی ئەم لاپەڕەیەی دەستنووسەكە بەتاڵە. لاپەڕەی دواتر بە بەیانی بەرەنجامی تێگەیشتنی مادیانەی مێژوو دەست پێدەكات. (ڕ)

چالاکی دێرینە لە هەلومەرجێکی تەواو گۆڕاودا درێژە پێ ئەدات و لە لایەکی ترەوە بە چالاکییەکی تەواو گۆڕاوەوە هەلومەرجی کۆن دەگۆڕێت. ئەم بابەتە دەتوانرێت بەهۆی گومانکردنەوە بەو جۆرە بشێوێندرێت کە گوایە مێژووی دواتر ئامانجی مێژووی پێشتر پێکدەهێنێت، بۆ نموونە ئامانجێک کە دەدرێتە پاڵ دۆزینەوەی ئەمریکا ئەمەیە کە [خواستی] بەجۆشی شۆڕشی هەڕەنسا بەرەو پێشەوە بەرێت. بە هۆی ئەمەوە مێژوو ئامانجە تایبەتییەکانی خۆی دەبێت و دەبێتە "کەسی هاوجۆری باقی کەسەکان" (وتە " خۆهووشیاری، رەخنە، تاقانە"و هتد)، ئێستا ئەوەی کە ئەو شتە بە ووشەکانی "رێز"، "ئامانج"، "خانە" یا "لێکدانەوە" لەبارەی مێژووی رابردووەوە دەردەخرێت، شتێکی جیا لە تەجرید کردن لە مێژووی دواتر، لەکاریگەری چالاکییەک کە مێژووی پێشوتر خستوویەتییە سەر مێژووی دواتری، نییە.

هەرچی مەیدانە جیاوازەکانە، کە کاریگەری دەکەنە سەر یەکتر، لە رەوتی ئەم گەشەکردنەدا بەرفراوان دەبن و هەرچی گۆشەگیری سەرەتایی نەتەوە جیاوازەکانە لەلایەن شێوەی پێشکەوتووی بەرهەمهێنان، لەلایەن ئاڵوگۆڕو لەلایەن دابەشبوونی سروشتی کار کە لەئەنجامدا لە نێوان نەتەوە جۆراو جۆرەکاندا دێتە دەست، زیاتر لەبەر یەک هەڵدەوەشێنێت، مێژوو زیاتر دەبێتە مێژووی جیهانی. بەمشێوەیە، بۆ نموونە ئەگەر لە ئینگلستان ئامێرێک دادەهێنرێت کە کرێکارانێکی زۆر لە هیندستان و چین لە نان خواردن دەخات و هەموو شکڵەکانی ئەم ئیمپراتۆریانە ژێرەو ژوور دەکات، ئەم داهێنانە دەبێتە واقعیەتێکی مێژوویی – جیهانی. یا لایەنی شەکرو قاوە لەبەرچاو بگرە کە گرنگییە مێژوویی – جیهانییەکانیان لە سەدەی نۆزدەهەمدا بەم راستییە دەسەلمێنرێت کە وون بوونی ئەم بەرهەمە، کە هۆکارەکەی سیستەمی کیشوەری ناپلیۆنی20بوو، بووە هۆی ئەوەی کە ئەڵمانییەکان لەدژی ناپلیۆن هەستن و بەمشێوەیە بووە بنەمای واقعی جەنگە ئازادیخوازو شکۆمەندەکانی 1813. لێرەدا دەردەکەوێت کە ئەم گۆڕانکارییەی مێژوو بەمێژووی جیهانی بە هیچ جۆرێک کارێکی دابڕو لەلایەن "خۆهووشیاری"، رۆحی جیهانی و یا هیچ یەک لەتارمایەکانی سەرو سروشتێکی ترەوە نییە، بەڵکوو کارێکە بەتەواوی مادییەو ئەزموونانە شایەنی جێبەجێبوونە، کارێک کە کارتی سەلماندنەکەی هەر کەسێک بەهاتووچوی خۆی، خواردن و خواردنەوەو جل و بەرگی خۆی بەدەستی دەهێنێت.

لە مێژووی تائێستادا بێگومان ئەمەش راستییەکی ئەزموونییە کە کەسەکان جیاوازانە بە فراوان کردنی مەودای چالاکی خۆیان بەوێنەی چالاکییەکی مێژوویی–جیهانی، زیاتر و زیاتر لە دەستی هێزێکی بێگانە بەخۆیان (زەختێک کە ئەوان بە شێوەی ئەفسونی ناپاک لەلایەن بەحساب رۆحی جیهانی و شتی لەو جۆرەوە بۆی دەچن) دەکرێنە کۆیلە، هێزێک کە گەورەترو گەورەتر بووەو لەدواسات دا بازاڕی جیهانی سەر هەڵئەدات. بەڵام ئەمەش رێک بەهەمان ئەندازە لەرووی ئەزموونییەوە سەلمێنراوە کە بەهەڵگێڕانەوەی هەلومەرجی کۆمەڵگا لەلایەن شۆڕشی کۆمۆنیستی (کە لە خوارەوە زیاتر لەبارەیەوە دێت) و بە هەڵوەشاندنەوەی خاوەندارێتی تایبەتی کە مترادفی ئەوە، ئەم هێزە کە تیۆریسیە ئەڵمانییەکانی تا ئەم ئەندازەیە پەرێشان کردووە، هەڵدەوەشێتەوە. وە دواتر ئازادی هەر یەکێک لە فەردە ئینسانییەکان بەهەمان پێوانە کە مێژوو بە شێوەیەکی تەواو دەبێتە مێژووی جیهانی، بەدەست دێت.[*] لەو شتەی لەسەرەوە هات بەروونی دەردەکەوێت کە دەوڵەمەندی فکری واقعی هەر کەسێک بە تەواوی بەستراوەتەوە بە دەوڵەمەندی پەیوەندییە واقعیەکانی ئەوەوە. تەنها ئەمە کەسە جیاوازەکان لەگەمارۆ جۆراوجۆرە نەتەوەیی و ناوچەیەکان رزگار دەکات، ئەوانە لەگەڵ بەرهەمهێنان (ولەوانە بەهەم هێنانی فکری) هەموو جیهان دەخاتە پەیوەندییەکەوەو بەدەستهێنانی زەمینەی بەهرەمەندبوون لەبەرهەمهێنانی هەمەلایەنەی سەرانسەری رووی زەوی (دروست کراوەکانی

* –[نووسینی پەراوێز لەلایەن مارکس:] دەربارەی بەرهەمهێنانی هووشیاری.

ئینسان)یان بۆ مەیسەر دەکات. وابەستەیی هەمەلایەنە، ئەم شێوە سرو شتییەی یەکەمین هاوکاری مێژوویی - جیهانی کەسەکان، لەلایەن ئەم شۆڕشە کۆمۆنیستییەوە دەگۆڕێت بەکۆنترۆڵ و زاڵبوونی هوو شیارانە بەسەر هێزەکاندا کە دەرهاویشتەی کاری ئینسانەکان بووە لەگەڵ یەکتردا، بەلام تائێستا هەر وەك هێزێکی تەواو بێگانە ئینسانەکانی زەلیل کردووەو فەرمانڕوایی بەسەرەوە کردوون. سەرلەنوێ ئەم رایە دووبارە دەتوانرێت بەرێگایەکی گومان ئامێزانەو ئایدیالیستی، واتە خەیاڵی، وەك "خۆ زاییندی جۆرەکان"("کۆمەڵگا بە وێنەی بابەت")، دەربېردرێت و بەو هۆیەوە زنجیرەی بەردەوامی کەسە پەیوەندیدارەکان لەگەڵ یەکتردا وەك کەسی تاك وەربگیرێت کە بە شێوەیەکی شاراوانە لەدایك بوونی خۆی بەدەست دێنێت. لەم نێوەدا ئاساییە کە کەسەکان بێگومان یەکتری، بەدەنی و زەیدی پێك دەهێنن، بەلام نەك بە شێوەی چەنەبازانەی قەدیس برۆنۆ و نە بەمانای "تاقانە" و ئینسانی "دروست کراو".

سەرەنجام لەم بۆچوونەی دەربارەی مێژوو کە لەلایەن ئێمەوە دەربڕدرا، ئێمە ئەم ئەنجامانەش وەردەگرین: (1)- لە [رەوتی] گەشەی هێزەکانی بەرهەمهێناندا قۆناغێك دێتە پێشەوە کە لەودا هێزەکانی بەرهەمهێنان و هۆیەکانی ئاڵوگۆڕ دەگەنە جێگایەك کە لەژێر پەیوەندییە باوەکاندا تەنیا وێرانی دەخوڵقێنن و ئیتر هێزەکانی بەرهەمهێنان نین بەڵکو تێکدەرن (مەکینەی ئامێرەکان و پارە) و لەپەیوەند بەوەوە چینێك دەردەکەوێت کە دەبێت هەموو باری کۆمەڵگا بخاتە سەرشانی، بێ ئەوەی کە لەپادا شتەکەی بەهرەمەندبێت، چینێك کە لەکۆمەڵگادا هەڵکەندراوەو ناچار کراوە تووندترین ناکۆکی لەگەڵ سەرجەم چینەکانی تردا هەبێت. چینێك کە زۆربەی ئەندامەکانی کۆمەڵگا پێك دەهێنێ و سەرچاوەی هوو شیاری بەپێویست بوونی شۆڕشێکی بنەڕەتی، هوو شیاری کۆمۆنیستییە، هوو شیاریەك کەبێگومان دەتوانێت لەنێوان چینەکانی تریشدا بەقووڵبوونەوە لەهەلومەرجی ئەم چینە پێك بێت. (2)-هەلومەرجێك کەتیایدا هێزە بەرهەمهێنەرە



دیاریکراوەکان دەتوانن بەکار بهێنرێن، هەلومەرجی دەسەلاتدارێتی چینێکی دیاریکراون کە توانا کۆمەلایەتییەکەی، کە بەرهەمی خاوەندارێتییەکەیەتی، بەیانی پراتیکی - ئامانجی خۆی لەهەر بارێکدا بە شێوی دەوڵەت هەیەو هەر بۆیە کە هەر خەباتێکی شۆڕشگێرانە روو لەدژایەتی چینێك دەکات کە تائەو کات لە دەسەلات دابووە.* (3)- لە هەموو شۆڕشەکانی پێشووتردا شێوەی هەڵسوڕان هەمیشە بەبێ گۆڕان دەمێنێتەوەو مەسەلە تەنیا لەسەر دابەشکردنە جیاوازەکانی ئەم چالاکییەو شێوەیەکی نوێ بوو لە دابەشکردنی کار لەنێوان کەسەکانیتردا، لەکاتێکدا شۆڕشی کۆمۆنیستی دژی شێوەی تائێستای چالاکی دەوەستێتەوە، کار هەڵدەپێچێ21 و دەسەلاتی هەموو چینەکان لەگەڵ خودی ئەم چینانەدا هەڵدەوەشێنێتەوە، چونکە لەلایەن چینێکەوە ئەنجام ئەدرێت کە ئیتر لەکۆمەڵگادا وەك چینێك نەژمێردرێت، وەك چینێك بەرەسمی نەناسرێت و لەخودی خۆیدا بەیانی هەڵوەشاندنەوەی هەموو چینەکان، نەتەوەکان و لەجۆری ئەوانەیە لە کۆمەڵگای ئێستاداو (4)- هەم بەمەبەستی بەرهەمهێنانی هوو شیاری کۆمۆنیستی لەئاستێکی جەماوەری و هەم بۆ سەرکەوتنی خودی کاری [کۆمۆنیزم]، گۆڕینی ئینسانەکان لە ئاستێکی جەماوەریدا پێویستە، گۆڕینێك کە تەنیا لەبزوتنەوەیەکی کردەوەییدا، لە شۆڕشێکدا دەتوانرێت روو بدات. بەم پێیە شۆڕش پێویستە، نە تەنیا بەهۆی ئەوەی کە چینی دەسەلاتدار لەهیچ رێگایەکی ترەوە ناتوانرێت لەنا و ببرێت، بەڵکو بەهۆی ئەمەش کە چینە لەناوبەرەکەی تەنیا لەیەك شۆڕشدا دەتوانێت خۆی لەهەموو گەندەڵییەکانی سەدەکان رزگار بکات و شایستەی پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی نوێ بێت.*

---

*-[نووسینی پەراوێز لەلایەن مارکس:] ئەم ئینسانانە بەرژەوەندییان لەپاراستنی هەلومەرجی ئێستای بەرهەمهێنندا هەیە.

*- [ئەم بەشەی ژێرەوە لەدەستنووسەکەدا خەتی بەسەردا هاتووە:] لەکاتێکدا کۆمۆنیستەکانی فەرەنسا، هەروەك کۆمۆنیستەکانی ئینگلستان و ئەڵمانیا، ماوەیەکی زۆرە لەسەر پێویستی شۆڕش رێکەوتوون، قەدیس برۆنۆ بەئارامی درێژە بەخەیاڵکردنەوە

## [7-کورتەی تێگەیشتنی ماتەریالیزمی مێژوو]

بەم پێییە، ئەم تێگەیشتنە مادییەی مێژوو لەسەر شیکردنەوەی پرۆسەی واقعی بەرهەمهێنان – بە دەستپێکردن لەبەرهەمهێنانی خودی ژیان – و لەسەر ناسینی شێوەی ئاڵوگۆڕی پەیوەست بەم شێوە بەرهەمهێنان و داهێنانەی ئەو، واتە کۆمەڵگای مەدەنی لە قۆناغە جۆراو جۆرەکانی ئەودا، وەك پایەی تەواوی مێژوو، پشت ئەستورە. کارەکەی بە وێنەی دەوڵەت وەسف دەکات و ئەوەش روون دەکاتەوە کە بە چ جۆرێك هەموو بەرهەمە جیاوازەکانی تیۆری و شێوەکانی هووشیاری، واتە دین، فەلسەفە، ئەخلاق و هتد لەوەوە سەرچاوە دەگرن و پرۆسەی پێکهاتنەکەی پەیڕەوی لەو بنەمایە دەکات. بەم شێوەیە بێگومان دەتوانرێت هەموو مەسەلەکە (و بەم پێییە کاریگەری بەرەو رووبوونەوەی ئەم

---

ئەدات، بەم خەیاڵەوە کە "هۆمانیزمی واقیعی" واتە کۆمۆنیزم "جێگای رۆحچێتی" (کە جێگایەکی نییە) دەگرێتەوە، تەنیا بەم مەبەستە تاکو بەشکم ببێتە مایەی رێز. ئەو دواتر لەخەیاڵی خۆیدا [بەم جۆرە] درێژەی پێئەدات کە "رزگاری" بەراستی "بەدەستدێت، زەوی دەبێت بە بەهەشت و بەهەشت بەزەوی". (خواناس هەرگیز ناتوانێت بەهەشت فەرامۆشبکات). "دواتر شادی و کامەرانی بۆ هەمیشە لەگەڵ سروودە ئاسمانیەکاندا دەزرنگێتەوە" باوکی پیرۆزی کڵێسە بەسەختی دەشڵەژێت کاتێك کەرۆژی قیامەت دەگاتە سەری، رۆژێك کەبڕیارە هەموو ئەوانە جێبەجێ بکرێت. رۆژێك کەرەنگی شارە بڵێسەدارەکان لەئاسماندا نیشانەی کازیوەی دەمەو بەیانییەتی، لەکاتێکدا هاوکات لەگەڵ "سروودە ئاسمانیەکان"، ئاهەنگی مارسیزو کارمەنیول، شان بەشانی ناڵەی بریسکەی تۆپەکان، لەگەڵ لێدانی ئامێرەکانی سەربڕین لە گوێچکەکانیدا دەنگ ئەداتەوە، کاتێك "جەماوەری" خوارەوە، هاواری دەبێت بڕوخێت بەرزدەکانەوەو "خۆهووشیاری" بەدار چڕاوە لەسێدارە ئەدەن. هیچ هۆیەك نییە کە قەدیس برۆنۆ بۆچوونێکی دڵگیر لە "شادی و کامەرانی ئاسەر" بدات. ئێمە چاو لەلەزەتی پێشبینیکراوی پێشووی کارەکانی قەدیس برۆنۆ لەرۆژی قیامەتدا دەپۆشین. جیا لەمە، بەراستی دژوارە ئاشکرابکرێت کەئایا پڕۆلیتەرەکانی لەحاڵی شۆڕشدا دەبێت هەروەك "جەوهەر"، هەروەك "جەماوەر"، خوازیاری روخاندنی رەخنە، یاهەروەك "رۆشنایی" رۆح کەهێشتا توانایەکی پێویستی بۆ هەزمکردنی فکرەکانی بوئر نییە، بەرجەستە ببێت.



لایەنە جۆراو جۆرانە لەسەر یەکتر) لە تەواوی ئەودا ببینرێت. ئەم تێگەیشتنە مادییە ناچار نییە وەك تێڕوانینی ئایدیالیستی بۆ مێژوو، لەهەر دەورانێکدا دوای چەمکێك بکەوێت، بەڵکو هەمیشە لەسەر رووی زەمینەی واقعی مێژوو دەمێنێتەوە. ئەم تێگەشتنە، پراتیك بەهۆی فکرەکانەوە روون ناکاتەوە بەڵکو پێکهاتنی فکرەکان بەهۆی پراتیکی مادییەوە روون دەکاتەوەو بەگوێرەی ئەوە دەگاتە ئەم ئەنجامە کە ناتوانرێت هەموو شێوەکان و بەرهەمەکانی هووشیاری بەرەخنە زەینییەکان، بەتواندنەوە لە "هووشیاری" یاگۆڕینی بە "تارماییەکان"، "رۆحەکان"، "ئارەزووەکان" و شتی لەم جۆرە لەناوببرێت، بەڵکو ئەوانە تەنیا لەرێگای ژێروژوورکردنی بەکردەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە واقعیەکان کەتوانای داوەتە ئەم فریوودانە ئایدیالیستییە لادەبرێت، وە بەم ئەنجامەش دەگات کە نەك رەخنەکان، بەڵکو شۆڕش هێزی جوڵێنەری مێژوو، دین و هەروەها فەلسەفەو هەموو شێوەکانی تری تیۆریشە. ئەم تێگەیشتنە دەریدەخات کە مێژوو بەتواندنەوە لە "خۆ هووشیاری" بە وێنەی "رۆحی رۆح" کۆتایی پێنایەت، بەڵکو هەر قۆناغێك بەرهەمێکی مادی، بەوێنەی کۆمەڵێك لەهێزەکانی بەرهەمهێنان و پەیوەندییەکی مێژوویانەی پێکهاتوو لەگەڵ سروشت و لەنێوان کەسەکاندا دەگرێتەوە کە لە پێشینانەوە دەدرێتە دەستی هەر نەوەیەك. کەڵەکەیەك لەهێزە بەرهەمهێنەرەکان کە لە لایەکەوە بەراستی لە لایەن نەوەی نوێوە دەگۆڕێت، بەلاّم لە لایەکی ترەوە هەلومەرجی ژیانیش بۆ ئەم نەوەیە لەبار دەکات و دۆزینەوەیەکی دیارو خسڵەتێکی تایبەتی دەداتێ. ئەم تێگەیشتنە دەریدەخات بەهەمان رادە کە ئینسانەکان هەلومەرج و دەورانەکان پێك دەهێنن، هەلومەرج و دەورانەکانیش ئینسانەکان پێك دەهێنێت.

ئەم کۆمەڵبوونی هێزەکانی بەرهەمهێنانە، واتە زەخیرە سەرماییەکان و شێوە کۆمەلاّیەتییەکانی ئاڵوگۆڕ، بنەمایەکی واقعی ئەو شتەیە کە فەیلەسوفەکان ئەوەیان هەر وەك "جەوهەر" و "زاتی ئینسان" وێنە کردووەو گەیاندویانەتە

پایەی خوداوەندی و لەوێدا دایان نیشانداوە: بنەمایەکی واقعی کە بەهۆی ئەم واقعیەتەوە کە هەیە سوفەکان لەدژی ئەو وەك "خۆ هوو شیاری"و "تاقانە" رادەپەڕن، بەهۆی ئەوو نفوزەکەیەوە بچووکترین شێواندنێك بەسەر گۆڕانی ئینسانەکاندا نەهاتووە. ئەم هەلومەرجی ژیانە کە نەوە جۆراو جۆرەکان پێکیدەهێنن، ئەوەش دیاریدەکەن کە ئایا تەکانی شۆڕشگێڕانە لەمێژوودا بە شێوەی دەورەیی دووبارە دەبنەوە، بەئەندازەیەکی تەواو وەها بەهێز دەبێت کە بنەمای هەموو شتەکان هەڵگێڕێتەوە یان نا. وەئەگەر ئەم پێکهێنەرە مادیانەی شۆڕشێکی تەواو–واتە لەلایەکەوە ئەو هێزە بەرهەمهێنەرانەی کە هەن و لە لایەکی ترەوە شکڵگرتنی جەماوەرێکی شۆڕشگێڕ کە نەتەنیا لەدژی هەلومەرجی جیای ئەم کۆمەڵگایە، بەڵکو لە دژی خودی شێوەی 'لبەرهەمهێنانی ژیان" و "سەرجەم چالاکییەك" کە بنەماکەیەتی هەڵدەستێت. ئەگەر ئەم پێکهێنەرە مادییە ئامادە نەبێت، لەو شێوەیەدا لەرووی گۆڕانی عەمەلییەوە بەتەواوی وەك یەك وایە ئایا فکرەی ئەم شۆڕشە سەد جار تائێستا بەیانکراوە یان نا، هەر وەك چۆن مێژووی کۆمۆنیزم ئەوە دەسەلمێنێت.

## [8هنا ئینسجامی تێگەیشتنی ئایدیالیستی مێژوو بەشێوەیەکی گشتی و فەلسەفەی ئەڵمانی دوای هیگڵ بەشێوەیەکی تایبەتی]

لەسەرجەم تێگەیشتنی تائێستای مێژوودا، ئەم پایە واقعییەی مێژوو یا بەتەواوی لەبەرچاو نەگیراوە یاوەك مەسەلەیەکی لاوەکی و تەواو بێپەیوەند بەرێبازی مێژووەوە وەرگیراوە. مێژوو بەم پێیە گوایە دەبێت بەگوێرەی پێوانەیەکی دەرەکی و لاوەکیانە بنووسرێتەوە: بەرهەمهێنانی واقعی ژیان نامێژوویانە دێتە بەرچاو، لەجێگایدا شتێك بەمێژووییانە دێتە بەرچاو کە جیا لەژیانی ئاسایی و



سەروو زەوییەوە بێت. بەم کارە پەیوەندی ئینسان لەگەڵ سروشت لەمێژوودا لادەبرێ و بەم حسابە ناکۆکی نێوان سروشت و مێژوو دروستدەکرێت. لەئەنجامدا لایەنگرانی ئەم تێگەیشتنە لەمێژووی تائێستادا تەنیا توانیویانە رووداوە سیاسییە بەرجەستەکان و ململانێ دینی و نەزەرییەکان لەمێژوودا ببینن و بەکورتی لەبەردەم هەر دەورانێکی مێژووییدا بەناچار بوونەتە هاوبەشی خۆش خەیاڵیەکانی ئەو دەورانە. بۆ نموونە ئەگەر دەورانێك لەبارەی خۆیانەوە بەو جۆرە بیربکەنەوە کە تەنیا لەلایەن هۆیەکانی "سیاسی" یا "دینی"یەوە خراوەتە جوڵەوە، هەرچەندە کە "سیاسەت" و "دین" تەنیا شێوەکانی هۆکارە حەقیقییەکانی ئەوەن، مێژوونووس ئەم بیروڕایانە قبوڵ دەکات. "خەیاڵ" یا "تێگەیشتن"ی ئەو خەڵکانەی باسیان دەکەین لە پراتیکی واقعییاندا دەگۆڕێت بەتاکە هێزی دیاری کەرو کاریگەر کە زاڵە بەسەر پراتیکی ئەواندا و ئەوە دیاریدەکەن. لەکاتێکدا شێوەی کاڵ و کرچ و سەرەتایی دابەشبوونی کارێك کەلەنێوان هندییەکان و میسرییەکاندا دەست دەکەوێت، سیستەمی تایەفەیی لەدەوڵەت و دینی ئەواندا پێك دێنێت، مێژوونووس لەو باوەڕەدایە کە سیستەمی تایەفەیی دەسەڵاتێکە کە ئەمشێوە کۆمەڵایەتییە کاڵ و کرچ و سەرەتاییەی پێك هێناوە.

لەکاتێکدا فەڕەنسییەکان و ئینگلیزەکان لانی کەم پەنا دەبەنە بەر وەهمی سیاسی، کە بەهەر حاڵ لە واقعیەتەوە نزیکترە، ئەڵمانییەکان لەقەڵەمڕەوی "رۆحی رووت"دا حەرەکەت دەکەن و وەهمی دینی بەهێزی جوڵێنەری مێژوو دادەنێن. فەلسەفەی مێژوویی هیگل دوا ئەنجامەکانی هەموو ئەم مێژوو داڕێژە ئەڵمانییەیە کە بە "شێوەترین بەیان" کورت کراوەتەوە و لەودا مەسەلە نەك لەسەر بەرژەوەندییە واقیعیەکان و یا تەنانەت سیاسی، بەڵکو لەسەر ئەندێشە رووتەکانە. ئەم مێژوو داڕشتنە بێگومان دەبێت لە روانگەی قەدیس برۆنۆدا بە شێوەی زنجیرەیەکی 'ئەندێشەکان" کە یەکتر قووت ئەدەن و سەرەنجام لە "خۆ

هوو شیاری"دا ئەتوێنەوە، دەرکەوێت*. وە تەنانەت منسەجیمتر لەوە دەبێت ڕێبازی مێژوو لە روانگەی قەدیس ماکس شترنردا، کە شتێك دەربارەی مێژوو نازانێت، هەر وەك "چیرۆکی دلاوەران، ڕێگرەکان و دێوەکان" بێتە بەرچاو کە بێگومان ئەو تەنیا بەیارمەتی "ناپیرۆزی" دەتوانێت خۆی لە شەڕی بەرەو روو بوونەوەی ئەوان رزگاربکات. ئەمە لەراستیدا تێگەیشتنێکی دینییە: ئینسانی دینی بە وێنەی ئینسانی سەرەتایی، بە خاڵی دەست پێکردنی مێژوو، بە فەرز وەردەگرێ و لە خەیاڵی خۆیدا بەرهەمهێنانی دینی دەخاتە جێگای بەرهەمهێنانی واقعی هۆیەکانی بژێوی و خودی ژیانی واقعییەوە.

سەرجەمی ئەم تێگەیشتنە لە مێژوو، هاوکات لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەکەیی و لەو ترس و غیرەتە ویژدانییەی کە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت، تەنیا مەسەلەیەکی نەتەوەیی ئەڵمانییەکانە و تەنیا ئیعتیبارێکی ناوچەیی بۆ ئەڵمانییەکان هەیە. بۆ نموونە مەسەلەیەکی گرنگ کە لەم دەورانەی دواییدا جێگای باس بووە، بەم جۆرەیە: بە چ جۆرێك کەسێك "لە قەڵەمڕەوی خوداوە تێدەپەڕێت بۆ قەڵەمڕەوی ئینسان"؟ وەك بڵێی "قەڵەمڕەوی خودا" هەرگیز بێجگە لە خەیاڵدا بوونی هەبووە و جەنابە پایە بەرزەکان بەبێ ئەوەی کە خۆیان پێی بزانن، بەردەوام لە "قەڵەمڕەوی ئینسان"دا نەژیاون کە ئێستا خەریکن ڕێگای ئەو بگرنە بەر. وەك بڵێی ئەم هونەربازییە فازیلانەیە (چونکە جیا لەمە شتێکی تر نین) واتە روونکەرەوەی نهێنی ئەم جادووە نەزەرییە بە پێچەوانەوە لە پیشاندانی سەرچاوەکانی ئەو لە هەلومەرجی واقعی زەمینیدا نییە. بەلای ئەم ئەڵمانیانەوە سەرجەم مەسەلەکە بە سادەیی بریتییە لەمەی کە ئەو پڕوپووچیانەی لەبەرامبەر خۆیاندا دەیبیننەوە وەك تەوزیح لە شتێکی نامۆی تردا حەل بکەن، واتە بریتییە لەو بە پێش فەرز وەرگرتنەی کە هەموو ئەم پڕوپووچیانە خاوەنی مانای تایبەتین کە دەتوانرێت

*–[نووسینی پەراوێز لەلایەن مارکس:] مێژوو ناسی بەحساب عەینی رێك بریتییە لە لێکۆڵینەوەی پەیوەندییە مێژووییەکان جیا لەچالاکییەکان. تایبەتمەندی کۆنەپەرستانە.



ئاشکرا بکرێت، لەکاتێکدا بەراستی مەسەلەکە تەنیا لەسەر روونکردنەوەی ئەم تەعبیرە تیۆریانەیە لەسەر بنەمای ئەو پەیوەندەیانەی بەراستی هەن. هەڵوەشاندنەوەی واقعی و بەکردەوەی ئەم تەعبیرانە، پاك کردنەوەی ئەم بۆچوونانە لە هوو شیاری ئینسانەکاندا هەر بەو جۆرەی کە پێشتر ووتمان، نەك لەرێگای ئەنجامە نەزەرییەکان، بەڵکو لەلایەن هەلومەرج و حاڵەتە گۆڕاوەکانەوە سەرهەڵئەدات. بۆ جەماوەری ئینسانەکان، واتە پڕۆلیتاریا، ئەم بۆچوونە نەزەرییانە بوونی نییەو هەر بۆیە داوای هەڵوەشاندنەوەی ناکەن و ئەگەر ئەم جەماوەرە هەرگیز بۆچوونێکی نەزەریشیان هەبوایە، لە جۆری دین، دەمێك بوو کەلەلایەن هەلومەرج و حاڵەتەکانەوە دەخرایە لاوە.

حەقیقەتی تەواو نەتەوەیی ئەم پرسیارانە و ڕێگا چارەکانیشی لەم واقعیەتەوە بەروونی دەردەکەوێت کە ئەم تیۆریسیینانە بەتەواوی لەو باوەڕەدان کە خەیاڵ دروستکراوەکانی وەك "خودا. ئینسان"، "ئینسان بە شێوەیەکی گشتی" و لە جۆری ئەوانە فەرمانڕەوایی دەورانە جۆراو جۆرەکانی مێژوویان کردووە (قەدیس برۆنۆ تەنانەت تا ئەم ئاستە ئەڕوات کە ئیدیعا بکات تەنیا "رەخنە و رەخنەگران مێژوویان پێك هێناوە") وەکاتێك خۆیان دەست بۆ سیستەمسازی مێژوویی دەبەن، بەتووندییەکی تەواوەوە بەسەر هەموو دەورانە مێژووییەکانی پێشوودا باز ئەدەن و لە "جەهالەت"ەوە بێ وەستان بە "مێژووی بە مانا"، بە مانایەکی تر بە مێژووی ساڵنامەکانی هالەئی و ساڵنامەکانی ئەڵمانی22 و بە پەرتەوازەبوونی مەکتەبی هیگلی و گۆڕینی ئەوە بە هەراو هورپایەکی گشتی دەگەن. ئەوان هەموو نەتەوەکانی تر، هەموو رووداوە واقعیەکان فەرامۆش دەکەن و رووی جیهان بەلایانەوە لە نمایشگای کتێبەکانی لایپزیك و گفتوگۆ بەرامبەریەکانی "رەخنە"، "ئینسان" و "یەك پارچە"دا23 کورت دەبێتەوە. ئەگەر یەکجاریش ئەم تیۆریسینانە بابەتە بەراستی مێژوویەکان، بۆ نموونە سەدەی هەژدەیەم بخەنە ژێر لێکۆڵینەوە تەنیا مێژووی بۆچوونەکان، جیا لە فاکتەکان و

گۆڕانە واقعیەکان کەلە پشتی ئەم بۆچوونانەوەن، دەردەخەن و تەنانەت ئەمەش تەنیا بەمەبەستی دەربڕینی ئەو دەورەیە بە وێنەی دەورەیەکی سەرەتایی ناتەواو، بە وێنەی رابردووی هێشتا بەرتەسکی سەردەمی مێژوویی، واتە دەورەی تێکۆشانی فەلسەفی لەئەڵمانیا لە 1840 – 1844 بەکار دەهێنن. هەر بەو جۆرەی کە دەکرێت چاوەڕوان بکرێت، کاتێك مێژووی دەورەیەکی پێشوو بەئامانجی بەرجەستەکردنەوەی ئامادەییەکانی کەسێکی نامێژوویی و خەیاڵی ئەو دەنووسرێتەوە، لە هەموو رووداوە بەراستی مێژووییەکان، تەنانەت هەموو کاریگەرییە بەراستی مێژووییەکانی سیاسەت لەمێژوودا، هیچ ناوێك ناهێنرێت. لە جێگای ئەمەدا ریوایەتێکمان نەك لەسەر بنەمای لێکۆڵینەوە بەڵکو لەسەر بنەمای پێشنیارە ئارەزووییەکان و چەنەی ئەدەبی، وەك ئەو شتەی قەدیس برۆنۆ لەمێژووی فەرامۆشکراوی سەدەی هەژدەهەمەکەیدا ئامادەی کردووە، دێتە دەستمان. ئەم وردە فرۆشە پڕئیدیعا و بەخۆنازەی ئەندێشەکان، کە خۆیان زۆر بەرزتر لەهەموو پێشداوەرییە نەتەوەییەکان دادەنێن، بەم جۆرە لەکردەوەدا زیاتر لەو مەشروبخۆرە عامیانە کە خەو بەئەڵمانیایەکی یەکگرتووەوە دەبینن، نەتەوەیی ترن. ئەوان کرداری سەرجەم نەتەوەکان وەك کرداری مێژوویی بەرەسمی ناناسن. ئەوان لەئەڵمانیا، لەسنووری بەرتەسکی ئەڵمانیا و بۆ ئەڵمانیا دەژین. ئەوان گۆرانییەکانی راین24 دەگۆڕن بە ستایشنامە دینییەکان و ئالزاس و لورین25 بەو جۆرە دەگرن کە لەجیاتی دەوڵەتی فەڕەنسا دەست بەسەر فەلسەفەی فەڕەنسیدا دەگرن و لەجیاتی بەئەڵمانی کردنی ویلایەتەکانی فەڕەنسا ئەندێشەی فەڕەنسییەکان دەکەنە ئەڵمانی. لە پەیوەند بەقەدیس برۆنۆو قەدیس ماکس، کە لەزاڵ بوونی جیهانگیری تیۆری زاڵبوونی جیهانگیری ئەڵمانیا رادەگەیەنن، جەنابی وندی26 بەجیهان نیشتمانێك دەژمێردرێت.



## [9تێگەیشتنی ئیدیالیستی مێژوو، شێوە کۆمۆنیزمی فیورباخ ]

لەم باسانەدا ئەمەش رووندەبێتەوە کە فیورباخ تاچ رادەیەك خۆی فریوو ئەدات کاتێك بەدانانی سیفەتی 'ئینسانی ئاسایی" خۆی بەکۆمۆنیست دەناسێنێت27. کۆمۆنیزم دەگۆڕێت بەبەڵگەی 'ئینسان بە شێوەی گشتی"، بە شتێك کە پێویستی بە 'ئینسان"ەو وابیر دەکاتەوە کەبەم شێوەیە لەوانەیە ووشەی 'کۆمۆنیست"، کە لە دنیای واقعیدا مانای پەیڕەوی حیزبێکی شۆڕشگێڕی دیاریکراو دەگەیەنێت، بگۆڕێت بەزاراوەیەکی رووت. سەرجەم بەڵگەکانی فیورباخ لەبەرامبەر پەیوەندی ئینسانەکان لەگەڵ یەکتریدا بەستراوەتەوە بەمەوە کە ئینسانەکان پێویستیان بەیەکتر هەیەو هەمیشە پێویستیان هەبووە. ئەو دەیەوێت بەهۆی ئەم واقعیەتەی هووشیاری بەدەست بهێنێت، بە واتایەکی تر ئەو وەك سەرجەم تیۆریسیینەکان تەنیا دەیەوێت کە هووشیارییەکی دروست دەربارەی ئەو واقعیەتێکی کە هەیە پێیك بهێنێت، لەکاتێکدا بۆکۆمۆنیزمی واقعی مەسەلە لەسەر هەڵگێڕانەوەی هەلومەرجی ئێستایە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئێمە بەتەواوی رێزی فیورباخ دەگرین کە لەهەوڵدانیدا بۆ پێکهێنانی هەمان هووشیاری، تا ئەو شوێنەی کە تیۆریسینێك دەتوانێت بەبێ ئەوەی کە لەتیۆریسیینی و فەیلەسوف بوون دابڕێت، بەرەو پێشەوە دەچێت. بەڵام ئەمە بۆ قەدیس برۆنۆو قەدیس ماکس تایبەتمەنییەکە کە بەبێ ووردبوونەوە، تێگەیشتنی فیورباخ لەکۆمۆنیزم دەخاتە جێگای کۆمۆنیزمی واقعی. ئەوان هەندێك جار بەو هۆیەوە دەست بۆئەم کارە دەبەن کە بتوانن لەگەڵ کۆمۆنیزمیشدا هەر وەك "رۆحی رۆح"، هەر وەك چەمکێکی فەلسەفی، هەر وەك نەیارێکی هاوتا، وە لەبارەی قەدیس برۆنۆ هەندێ جار لەسەر بنەمای بەرژەوەندی عەمەلی، بچنە شەڕەوە.

وەك نموونەیەك لە قبوڵكردن و لە هەمان كاتدا تێنەگەیشتنی واقعیەتی ئێستا، كە فیورباخ لەودا لەگەڵ نەیارانی ئێمەدا هاوبەشە، ئێمە پارچەیەك لەفەلسەفەی ئایندە دەخەینەوە بیر [خوێنەران] كە ئەو لەودا ئەوەرایە پێدەگەیەنێت كەبوونی شتێك یا ئینسانێك هەمان زاتی ئەوەو هەلومەرجی دیاریكەری بوون و شێوەی ژیان و چالاكی ئاژەڵێك یا كەسێكی ئینسانی ئەو شتانەن كە "زات"ی ئەو خۆی تیایاندا بەڕازی كراو هەست پێدەكات. لێرەدا هەر شازییەك رێك هەر وەك رێكەوتێكی ناپیرۆزو هەر وەك نارێكییەك كە ناتوانرێت بگۆڕدرێت، دادەنرێت. بەم شێوەیە ئەگەر ملیۆنان پرۆلیتەر لە هەلومەرجی ژیانیان رازی نەبن، ئەگەر "بوونی" ئەوان بەهیچ جۆرێك لەگەڵ "زات"یاندا نەیەتەوە، كەواتە بەگوێرەی ئەو پارچەی كە هێنامانەوە، ئەمە بەدبەختییەكی ناچارییە كە دەبێت بەئارامی تەحەمول بكرێت. ئەم ملیۆنان پرۆلیتەر، یاكۆمۆنیستە، بەلاّم بەتەواوی بەجۆرێكی تر بیر دەكەنەوەو ئەمە لەكاتێكدا، ئەو كاتەی كە "بوونی" خۆیان لەگەڵ "زات"ی خۆیاندا بەكردەوە بەهۆی شۆڕشێك هاوئاهەنگ دەكەن، دەسەلمێنن. بەم پێیە فیورباخ هەرگیز لەم بارەیەوە قسە لەدنیای ئینسان ناكات، بەڵكوو هەمیشە پەنا دەباتە بەر سروشتی دەرەكیو ئەویش بە سروشتێك كە هێشتا ملكەچی ئینسانەكان نەبووە. بەلاّم هەر داهێنانێكی نویّ، هەر پێشكەوتنێكی پیشەسازی، پارچەیەك لەم قەڵەمڕەوییە دەكاتەوە، بەجۆرێك زەوییەك كە نموونەی دەركەوتنی مەسەلەكانی فیورباخ پێك دەهێنێت بەردەوام لەحاڵەتی كەم بونەوەدایە. هەمان مەسەلە لەبەرچاو بگرین كە "زات"ی ماسی بریتییە لە "بوون"ی ئەو، واتە ئاوەكەیە. "زات"ی ماسی رووبارێك ئاوی رووبارەكەیە. بەلاّم هەر كە رووبارەكە خرایە خزمەتی پیشەسازی، هەر كە ئاڵودەی رەنگەكان و خڵتەكان بوو، وە پاپۆڕە هەڵمییەكانی تیادا بڕوات، وەیا هەر كە ئاوەكەی كرایە كەناڵەكانەوە كە خاڵیكردنی سادەی ئەوانە دەتوانێت ماسی لەهۆیەكانی بوونی بێبەش بكات، ئەم ئاوە ئیتر لەوە دەرچووە كە "زات"ی ماسی بێت و ئیتر هۆكاری بوونێكی گونجا و نابێت. ئەم روونكردنەوەیە كە هەموو ئەم



ناكۆكیانە نارێكییەكی ناچارین، جیاوازییەكی بناغەیی لەگەڵ ئەو دڵخۆشكردنەدا نییە كە قەدیس ماكس شتنر دەیداتە ناڕازیان و دەڵێت كە ئەم ناكۆكییە ناكۆكی ئەوان و ئەم گرفتە گرفتی ئەوانە و لەئەنجامدا یا دەبێت مێشكی خۆیان هێور بكەنەوە، نەفرەتەكانیان قووت بدەنەوە، یا بەرێگایەكی خەیاڵی بەسەریدا راپەڕن. تەنیا ئەوەندەش جیاوازی لەگەڵ ئیدیعای قەدیس برۆنۆدا هەیە كە بەگوێرەی ئەمە ئەم هەلومەرجە ناپیرۆزە بەهۆی ئەم واقعیەتەوەیە كە ئەو كەسانە لەپۆخڵەواتیەكانی "جەوهەر"دا غەرقبوون، تا "خۆهوو شیاری رەها" بەرەو پێشەوە نەچوون و تێناگەن كە ئەم هەلومەرجە ناسەركەوتووە رۆحی رۆحی ئەوانە.

[///]

## [1-چینی دەسەڵاتدارو بیروباوەڕە زاڵەکان.

## بە چ جۆرێك تێگەیشتنی هیگلی لەزاڵبوونی ڕۆح بەسەر مێژوودا سەری هەڵدا]

بیروباوەڕەکانی چینی دەسەڵاتدار لەهەر دەورانێکدا بیروباوەڕە زاڵەکانن، واتە چینێك کە هێزی زاڵی ***ماددی*** کۆمەڵگایە، لەهەمان کاتدا هێزی دەسەڵاتداری ***مەعنەویشییەتی***. چینێك کە هۆیەکانی بەرهەمهێنانی ماددییان لەبەر دەستدایە لەئەنجامدا هۆیەکانی بەرهەمهێنانی زەینییش کۆنترۆڵدەکات، بەجۆرێك کە بیروباوەڕی ئەوانەی کە هۆکاری بەرهەمهێنانی زەینیان نییە لەگشتیدا پەیڕەوی لەو دەکەن. بیروباوەڕە باڵا دەستەکان شتێکی جیا لەبەیانی ئەندێشانەی پەیوەندییە ماددییە زاڵەکان، واتە پەیوەندییە ماددییە زاڵە ناسراوەکان لەشێوەی فکرەکاندا نییە، وەبەم پێیە شتێکی جیا لەبەیانی بیروباوەڕی ئەو پەیوەندییانەی کە چینێك دەکاتە چینێکی زاڵ و بەم پێیە بیروباوەڕەکانی [ئاراستەکەری] زاڵی ئەو چینە نییە. ئەو کەسانەی چینی دەسەڵاتدار پێك دەهێنن خاوەنی شعوریشن و کەواتە بیر دەکەنەوە. بەمشێوەیە لەبەر ئەوەی کە ئەوان وەك چینێك فەرمانڕەوایی دەکەن و سنورو بازنەی دەورانێکی مێژوویی دیاریدەکەن، ئاساییە کە ئەم کارە لەهەموو بوعدەکانی ئەودا بەکار دەهێنن، هەر بۆیە وەك بیرکەرەوەکان، وەك بەرهەمهێنەرانی بیروباوەڕەکانیش فەرمانڕەوایی دەکەن و بەرهەمهێنان و دابەشکردنی ئەندێشەکانی سەردەمی خۆیان ڕێك دەخەن: بەمجۆرە بیروباوەڕە باڵادەستەکانی ئەو دەورانەن. بۆ نموونە ئەگەر لەیەك سەردەم و لەیەك وڵاتدا، دەسەڵاتی سەڵتەنەتی، خانەدانەیی و بورژوازی لەسەر دەسەڵات ململانێی یەکتربکەن و بەگوێرەی ئەمە دەسەڵات دابەشکرابێت، دکتۆرینی جیاکەرەوەی بەهێز دەبێتە ئەندێشەی زاڵ و بەشێوەی یەك "یاسای هەمیشەیی" ڕادەگەیەنرێت.

دابەش بوونی کار کە ئێمە لەسەرەوە ئەومان وەك یەکێك لەهێزە گشتییەکانی مێژووی تائێستا بینی، لەچینی فەرمانڕەوایشدا خۆی بەشێوەی دابەشبوونی کاری بەدەنی و فکری دەردەخات، بەجۆرێك کە لەهەناوی ئەم چینەدا بەشێك هەر وەك بیرکەرەوەکانی چینەکە دەردەکەوێت (ئایدیۆلۆژیسینە چالاکە بیرکەرەوەکان کە سەرو سیمادان بەوەهمەکانی چینەکە لەبارەی خۆیانەوە دەکەنە سەرچاوەی گشتی بژێوی خۆیان)، لە کاتێکدا هەڵوێستی ئەوانیتر بەم باوەڕو وەهمانە زیاتر هەڵچوونی و ڕازی بوونانەیە، لەبەر ئەوەی کە لەڕاستیدا ئەوانە ئەندامی چالاکی ئەم چینەن و کەمتر بۆ پێکهێنانی فکرو وەهمەکان لەبارەی خۆیانەوە کاتیان هەیە. لەناو چینی فەرمانڕەوادا ئەم قڵشتە دەتوانرێت بگۆڕێت بۆ نەیاری و دووژمنایەتی لەنێوان ئەم دوو بەشەدا، بەڵام هەر کات بەکردەوە پێکدادانێك روو بدات کە تیایدا خودی چینەکە بکەوێتە مەترسییەوە، ئەم نەیاریانە خۆبەخۆ دەچنە لاوەو لەم حاڵەتەدا دەرکەوتنی بیروباوەڕە زاڵەکان بەو جۆرەی کە بیر و باوەڕی چینی دەسەڵاتدار نین و دەسەڵاتێکی جیاوازیان لەدەسەڵاتی چینەکەش هەیە لەناو دەچن. بوونی بیر و باوەڕە شۆڕشگێڕییەکان لەهەر دەورانێکی تایبەتدا پێویستی بەبوونی چینێکی شۆڕشگێڕە. لە بارەی فەرزیاتەکانی ئەمەیان بەئەندازەیەکی تەواو لەسەرەوە قسەمان کردووە.

ئێستا ئەگەر ئێمە لەسەرنج دانمان لەڕەوتی مێژوو، بیروباوەڕەکانی چینی فەرمانڕەوا لەخودی چینی فەرمانڕەوا جیا بکەینەوەو بوونێکی سەربەخۆ بخەینە پاڵی، ئەگەر ئێمە بەووتنی ئەوەی کە ئەم یا ئەو بیروباوەڕانە لە دەورەیەکی دیاریکراودا زاڵبوون، کۆتایی پێبێنین، بەبێ ئەوەی لەبارەی هەلومەرجی بەرهەمهێنانی ئەم بیروباوەڕانە و بەرهەمهێنەرەکانییەوە زەحمەتێك بکێشین و ئەگەر بەمشێوەیە کەسەکان و هەلومەرجی جیهانی کە سەرچاوەی ئەم

بیر وباوەڕانەن لەبەرچا و نەگرین، ئەوکات دەتوانین بۆ نموونە بڵێین کاتێك کە خاوەنداریێتی زاڵبوو تێگەیشتنەکانی شەرەف، وەفاداری و لەجۆری ئەوان زاڵبوون و لە ماوەی زاڵبوونی بورژوازیدا فەهمەکانی ئازادی، یەکسانی و لەجۆری ئەوانە. خودی چینی فەرمانڕەوا بەگشتی وەها بیری لێدەکاتەوە. ئەم تێگەیشتنە لە مێژوو کە لەنێوان هەموو مێژوو نووسەکاندا، بەتایبەتی لە سەدەی هەژدەیەم بەم لاوە، هاوبەشە، بەناچاری بەرەو رووی ئەم دیاردەیە دەبێتەوە کە بۆچوونەکان هەرچی دابڕاوتر، واتە ئەو بۆچوونانەی کە هەرچی زیاتر شێوەی گشتی بەخۆیانەوە دەگرن، دەستێکی بالآیان هەیە. چونکە هەر چینێکی نوێ کە خۆی دەخاتە جێگای چینێك کەپێش ئەو فەرمانڕەوایی کردووە، تەنیا بەهۆی بەرەو پێشبردنی ئامانجی خۆی ناچارە کە بەرژەوەندی خۆی بەناوی بەرژەوەندی هاوبەشی هەموو ئەندامانی کۆمەڵگا، بە واتایەکی تر بەیانکراو لەقاڵبی بیر وباوەڕەکاندا دەربڕێت: ناچارە رواڵەتێکی گشتی ببەخشێتە بیروباوەڕەکانی خۆی و ئەوە وەك تەنیا بۆچوونە عەقلانیەکانی خاوەن ئیعتیباری گشتی بناسێنێت. چینێك کەشۆڕش دەکات هەر لەسەرەتاوە ئەگەر بەهۆی ئەوەیشەوە بووە کە نەیاری لەگەڵ ***چینێکدا*** هەیە، خۆی نەك وەك چینێك بەڵکو بەناوی نوێنەری سەرجەم کۆمەڵگا، بەناوی سەرجەم جەماوەری کۆمەڵگایەك کە کەوتۆتە بەرامبەر چینی فەرمانڕەوا، دەناسێنێت[*]. ئەم چینە لەم رووەوە توانای وەها کارێکی هەیە کە بەرژەوەندی ئەو لەسەرەتادا بەگشتی لەگەڵ بەرژەوەندی هاوبەشی هەموو چینە نافەرمانڕەواکاندا پەیوەندییەکی واقعی هەیە، چونکە لەژێر فشاری ئەو هەلومەرجەی تائێستا هەیە بەرژەوەندی ئەو نەیتوانیووە هەروەك بەرژەوەندییەکی تایبەت بەچینێکی تایبەت گەشەبکات. بەم پێیە

---

[*]–[نووسینی پەراوێز لەلایەن مارکس:](هەمووی دێتەوە لەگەڵ (1)چین لەبەرامبەر بەتوێژ، (2)_ململانێ، ئالوگۆڕی جیهانیو جۆری ئەو، (3)_هێزی ژمارەیەکی گەورەی چینی دەسەڵاتدار، (4)_وەهمی بەرژەوەندی ***هاوبەش.*** لەسەرەتادا ئەم وەهمە راستە، (5)_فریوخواردنی ئایدیۆلۆژیسینەکانو دابەشبوونی کار.



سەرکەوتنی ئەو بەقازانجی زۆرێك لەکەسی چینەکانی تریش کە لەجێگاو رێگای زاڵ بەهرەمەند نین تەواو دەبێت. بەڵام تەنیا تائەو شوێنەی کە توانا بداتە ئەم کەسانە خۆیان بۆنا و چینی فەرمانڕەوا هەڵکێشن. کاتێك کە بورژوازی فەرەنسا فەرمانڕەوایی خانەدانەیی لەناو برد، بۆ زۆرێك لەپرۆلیتارەکان ئیمکانی ئەوە فەراهەم بوو کە خۆیان لەریزی پرۆلیتاریا بەرەو سەروتر بەرن، بەڵام تەنیا تا ئەو شوێنەی کە ببنە بورژوا. بەم پێیە هەر چینێکی نوێ لەسەر پێگەیەکی بەرفراوانتر لەپێگەی چینی فەرمانڕەوای پێشوو دەسەڵات بەدەستەوە دەگرێت. لەلایەکی ترەوە لەم حاڵەتەدا نەیاری چینی نافەرمانڕەوا لەگەڵ چینی فەرمانڕەوای نوێیشدا هەرچی زیاتر توندتر و قوڵتر دەبێتەوە. هەر دوو ئەمانە حوکم بەسەر ئەو واقعیەتەدا دەکەن کە خەباتێك کە دەبێت لەدژی ئەو چینە فەرمانڕەوا نوێیە بەرەو پێشەوە ببرێت، بەگوێرەی خۆی لەناوبردنی تەواویتر و رادیکالتر لەهەلومەرجی پێشووی کۆمەڵگا دەکاتە ئامانجی خۆی، تەواویتر و رادیکالتر لەو شتەی تەواوی چینەکانی پێشوو کە بەشوێن دەسەڵاتەوە بوون، دەیانتوانی بیکەنە ئامانجی خۆیان.

سەرجەم ئەم دیاردەیە کەفەرمانڕەوایی چینێکی دیاریکراو تەنیا فەرمانڕەوایی بۆچوونە دیاریکراوەکانە، بێگومان بەتەنیا ئەوەی کە فەرمانڕەوایی چینەکان بەگشتی ئیتر شکڵی نەبێت کە کۆمەڵگا بەگوێرەی ئەو رێکدەخرێت، بەمانایەکی تر بەتەنیا ئەوەی کە ئیتر پێویست نەکات کە یەك بەرژەوەندی بەتایبەتی هەر وەك بەرژەوەندییەکی گشتی، یا "بەرژەوەندی گشتی" هەر وەك بەرژەوەندییەکی دەسەڵاتدار دەربڕیەت، دەگاتە کۆتایی سروشتی خۆی.

کاتێك کەبیروباوەڕە زاڵەکان لەکەسە فەرمانڕەواکانو زیاتر لەهەر شتێك لەو پەیوەندیانەی کەبەرهەمی قۆناغێکی دیاریکراوی شێوەیەکی بەرهەمهێنانن، جیا بووبێتنەوەو بەم شێوەیە ئەم ئەنجامە وەرگیرابێت کەمێژوو هەمیشە لەژێر دەسەڵاتی بۆچوونەکاندایە، ئیتر زۆر سادەیە کە لەم ئەندێشە جۆراوجۆرانەدا،

[تێگەیشتنە رووتەکانی وەك ] "فکرەی رەها"، ئەندێشەو لەجۆری ئەوانە بەوێنەی هێزێکی زاڵی مێژوویی دابڕاو بکرێت و بەم شێوەیە هەموو باوەڕو تێگەیشتنەکان بەناوی "شێوەکانی هەڵبژاردن"ی ***تێگەیشتنی*** رەها کە لەمێژوودا گەشە دەکات وەرگرێت. بەدوای ئەم کارەدا بێگومان دەتوانرێت هەموو پەیوەندییەکانی ئینسان لەتێگەیشتنی ئینساندا، ئینسان لەتصوردا، زاتی ئینسان، لە***ئینسان بەشێوەیەکی گشتی***، وەربگیرێت. ئەم کارە لەلایەن فەلسەفەی نەزەرییەوە ئەنجام دراوە. هیگل خۆی لەکۆتایی ***فەلسەفەی مێژوو***دا دانی پێدا ئەنێ کە ئەو "تەنیا پێشرەوی ***تێگەیشتن*** دەداتە بەر باس" و لەمێژوودا، "***خواناسی بەڵگەیی راستی***" دەربڕیوە. ئێستا دەتوانرێت دووبارە بگەڕێینەوە سەر بەرهەمهێنانی "تێگەیشتن"، سەر تیۆریسینەکان، ئایدلۆژیسینەکان و فەیلەسووفەکان و ئەو کات بگەینە ئەم ئەنجامە کە فەیلەسوفەکان، بیرکەرەوەکان بەشێوەیەکی گشتی، لەهەموو کاتەکانی مێژوودا بالادەست بوون: ئەنجامێك بەو جۆرەی کە دەیبینین لەلایەن هیگلیشەوە بەیان کراوە.

بەم شێوەیە سەرجەم مەکری سە لماندنی بالادەستی رۆح لەمێژوودا (شترنر پێی دەڵێت زنجیرەی پلەوپێیە) تەنیا پێویستی بەئەنجامدانی ئەم سێ کارەی خوارەوە هەیە:

1 - شەخسەکە دەبێت ئەندێشەی کەسانێك کە بەبەڵگە ئەزموونیەکان، لەژێر هەلومەرجێکی ئەزموونی و بەوێنەی کەسانی واقعی لەدەسەڵاتدان لەم دەسەڵاتدارانە جیا بکاتەوەو بەم شێوەیە دەسەڵاتدارێتی بیروباوەڕەکان یا وەهمەکان بەرەسمی بناسێت.

2 - شەخسەکە دەبێت دەسەڵاتی ئەم بیروباوەڕانە رێك بخات، [بوونی] پەیوەندییەکی نهێنی ئامێز لەنێوان فکرە زاڵە بەردەوامەکان بسەلمێنێت، کە ئەم کارە بەوەرگرتنی ئەوانە وەك "شێوەکانی هەڵبژاردنی تێگەیشتن" دەکرێت (ئەم کارە دەکرێت چونکە یەکەم ئەم بیروباوەڕانە بەهۆی پێگەی ئەزموونیانەوە



بەراستی بەیەکەوە پەیوەستن، وەدووەم کاتێك وەك بۆچوونە ***رووتەکان*** وەربگیرێت، بەشێوەی خۆ -جیاواز، جیاکراوە بەهۆی ئەندێشەوە دەردەکەون).

3 -بۆ روونکردنەوەی روالەتە نهێنی ئامێزەکەی دەبێت ئەم "تێگەیشتنە ئۆتۆنۆمە" بەیەك کەس، واتە "خۆ هووشیاری"، یا بۆ ئەوەی کە بەتەواوی ماتەریالیستی بێتە بەرچاو، بەزنجیرە کەسانێك کە لەمێژوودا نوێنەرایەتی "تێگەیشتن" دەکەن، بە"بیرکەرەوەکان"، بە "فەیلەسوفەکان"، کەئەوانیش وەك دروستکەرانی مێژوو وەك "شورای چاودێران"، وەك دەسەڵاتداران دەناسرێت، بگۆڕدرێت[*]. بەم شێوەیە تەواوی پەیکەرەی پێکهێنەری ماتەریالیستی لەمێژوو لادەبرێ و ئەوکات دەتوانرێت بەتوانایەکی تەواوەوە غار بەئەسپی سەر کێشی خەیاڵ بکرێت.

ئەم میتۆدەی مێژوو کە لەئەڵمانیادا بالا دەست بوو بەتایبەت چۆنیەتییەکەی لەسەر پەیوەندی ئەو لەگەڵ وەهمی ئایدیۆلۆژیسینەکاندا بەگشتی، بۆ نموونە وەهمی قازیەکان، سیاسەتمەدارەکان (لەوانە دەوڵەتدارە عەمەلییەکان)، لەسەر خەو و خەیاڵە دابڕاوەکان و لادانەکانی ئەو جەنابانەوە روونبکرێتەوە. ئەم کارە بەسادەییەکی تەواوەوە لەسەر جێگاورێگای ئەوانە لەژیان، کاری ئەوان و دابەشکردنی کارەوە روون دەکرێتەوە.

لەکاتێکدا لەژیانی ئاسایی هەر دووکاندارێکدا بەباشی دەتوانرێت لەنێوان ئەوەی کەسێك لەبارەی خۆیەوە دەری دەبڕێت و ئەوەی کەئەو بەراستی هەیە جیا بکرێتەوە، مێژوونووسی ئێمە تائێستا هێشتا نەیتوانیوە ئەم روانگە بەردەم خراوە بەدەست بهێنێت. ئەم مێژوونووسییە قسەی هەر دەورانێك بێ ئەم لاولا قبوڵ دەکات و لەو باوەڕەدایە کە هەرچی ئەو دەورانە لەبارەی خۆیەوە دەیڵێت و دەریدەبڕێت راستە.

---

[*]–[نووسینی پەراوێز لەلایەن مارکس:] ئینسان بەشێوەیەکی گشتی = "رۆحی ئینسانی بیرکەرەوە".

## [IV

### [1–ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و خاوەنداریێتی]

[ذ] لەخاڵی یەکەمدا دابەشبوونی کارێکی زۆر گەشە سەندوو و بازرگانییەکی بەرفراوان وەك پێش مەرج وەردەگیرێت. لەخاڵی دووەمدا ناوچەگەری. لەحاڵەتی یەکەمدا دەبێت کەسەکان لەدەوری یەکتر کۆبوبێتنەوە، لەحاڵەتی دووەمدا ئەوانە ئامرازەکانی بەرهەمهێنانن لەپاڵ ئەو ئامرازانەی کەهەن.

کەواتە لێرەدا جیاوازی نێوان ئامرازە سروشتییەکانی کارو ئەوانەی کە لەلایەن شارستانیەتەوە داهێنراون دەردەکەوێت. **کێڵگە** (ئاو و شتی تر) دەتوانرێت وەك ئامرازی سروشتی بەرهەمهێنان لەبەرچاو بگیرێت. لەحاڵەتی یەکەمدا، لەحاڵەتی ئامرازی سروشتی بەرهەمهێناندا، کەسەکان ملکەچی سروشتن. لەحاڵەتی دووەمدا ملکەچی بەرهەمی کارن. بەم پێیە لەحاڵەتی یەکەمی خاوەنداریێتی (خاوەنداریێتی زەوی) هەر وەك زاڵبوونی راستەوخۆی سروشت دەردەکەوێت، لەحاڵەتی دووەمدا هەر وەك زاڵبوونی کار، بەتایبەتی کاری کەڵەکەکراو، واتە سەرمایە. حاڵەتی یەکەم پێویستی بەمەیە کە کەسەکان لەگەڵ پەیوەندییەکانی وەك خێزان، تایەفەو زۆر شتی تردا یەکیان گرتبێت. حاڵەتی دووەم پێویستی بەوەیە کەئەوانە سەربەخۆ بوبێتن لەیەکترو تەنیا لەرێگای ئاڵوگۆڕەوە لەدەوری یەکتر کۆبوبێتنەوە. حاڵەتی یەکەم بەگشتی لەخۆگری ئاڵوگۆڕێکە لەنێوان ئینسانەکان و سروشتدا کە تیایدا کاری یەکەم لەگەڵ بەرهەمەکانی دووەمدا ئاڵوگۆڕ دەکرێن. لەحاڵەتی دووەمدا ئاڵوگۆڕ بەزۆری لەنێوان خودی ئینسانەکاندایە. لەحاڵەتی یەکەمدا عەقڵی سەلیمی مام ناوەندی ئینسانی بەسە. کاری بەدەنی و کاری فکری هێشتا جیا نەبوونەتەوە. لەحاڵەتی

[ذ] –لێرەدا چوار لاپەڕەی دەستنووسەکە وون بووە. (پ)



دووەمدا دابەشبوون لەنێوان کاری بەدەنی و فکری دەبێت بەکردەوە جێبەجێ کرابێت. لە حاڵەتی یەکەمدا زاڵبوونی خاوەندار بەسەر کەسێکی بێ خاوەنداریێتیدا دەتوانرێت لەسەر بنەمای پەیوەندییە شەخسییەکان، لەسەر بنەمای جۆرێك کۆمەڵبوون بکرێت. لەحاڵەتی دووەمدا دەبێت بەشێوەی لایەنێکی سێیەم، واتە پارە، شێوەی مادی بەخۆوە بگرێت. لەحاڵەتی یەکەمدا پیشەسازی بچووك بوونی هەیە، بەڵام پەیوەستە بە بەهرەبەرداری لەئامرازی سروشتی بەرهەمهێنان و بەم پێیە بەبێ دابەشکردنی کارە لەنێوان کەسە جۆرا وجۆرەکاندا. لەحاڵەتی دووەمدا پیشەسازی تەنیا لەهەناوی دابەشبوونی کارو لەرێگای ئەوەوە بوونی هەیە.

لێکۆڵینەوەی تائێستای ئێمە لە ئامرازەکانی بەرهەمهێنانەوە دەستی پێکردو تا ئێرە دەریخستووە کە خاوەنداریێتی بۆ قۆناغە دیاریکراوەکان لەگەشەی پیشەسازیدا پێوستییەك بوو. لەپیشەسازی دەرهێناندا28خاوەنداریێتی تایبەتی هێشتا لەگەڵ کاردا بەرامبەرە. لەپیشەسازی بچووك و سەرجەم کشتوکاڵی تائێستادا، خاوەنداریێتی بەرەنجامی پێویستی ئامرازەکانی بەرهەمهێنانە. ناکۆکی نێوان ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و خاوەنداریێتی تایبەتی تەنیا بەرەنجامی پیشەسازی گەورەیە کە دەبێت لەهەمان کاتدا زۆر گەشەی کردبێت تا ئەم ناکۆکییە بەرهەم بهێنێت. بەمشێوەیە تەنیا بەپیشەسازی گەورەیە کەهەڵوەشاندنەوەی خاوەنداریێتی تایبەتی مەیسەر دەبێت.

### [2–دابەشکرنی کاری بەدەنی و فکری. جیایی شارو لادێ. سیستەمی وشتەیی]

گرنگترین دابەشبوونی کاری بەدەنی و فکری، جیابوونەوەی شارو لادێیە. ناکۆکی نێوان شارو لادێ بەتێپەڕبوون لە بەربەریەتەوە بۆشارستانییەت،

لەتایەفەوە بۆدەوڵەت، لە ناوچەچێتییەوە بۆ نەتەوە دەست پێدەکات و بەدرێژایی مێژووی شارستانیەت تائەمڕۆ بەردەوامە (کۆمەڵی دژی قانوونی دانەوێڵە). [29]

دەرکەوتنی شار لەهەمان کاتدا، لەگەڵ خۆیدا پێویستی ئیداراتەکان، پۆلیس، باجەکان و هتد، وە لەیەك قسەدا پێویستی ئیدارەی شارو بەم پێیە سیاسەتی بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵدا. لێرەدا بوو کەبۆ یەکەم جار دابەشبوونی دانیشتوان بەسەر دوو چینی گەورەدا، دابەشبوونێك کەراستەوخۆ لەسەر بنەمای دابەشبوونی کارو ئامرازەکانی بەرهەمهێنان راوەستاوە، دەرکەوت. شار لەراستیدا، خۆی شوێنی کۆبوونەوەی دانیشتوان، ئامرازەکانی بەرهەمهێنان، سەرمایە، ئارەزووەکان و پێوستییەکانە، لەکاتێکدا لادێ رێك بەپێچەوانەی ئەم واقعیەتەوە واتە گۆشەگیری و جیایی نمایش دەکات. ناکۆکی شارو لادێ تەنیا لەچوارچێوەی خاوەندارێتی تایبەتیدا دەتوانرێت هەبێت. ئەمە خراپترین بەیانی ملکەچیەی کەسەکان بۆ دابەشبوونی کار، سەپاوە بەسەر چالاکییەکی دیاریکراودا ملکەچییەك کە ئینسانێکی بەیەك گیانلەبەری شاری بەرتەسك و ئەوی تری بەگیان لەبەرێکی لادێیی بەرتەسك گۆڕیوەو بەرەو رووبوونەوەی بەرژەوەندییەکانی ئەوان هەر رۆژە سەر لەنوێ دروستدەکاتەوە. سەرلەنوێ لێرەدا کاریش مەسەلەیەکی سەرەکییە، دەسەڵاتێکە بەسەر کەسەکاندا و لەبەر ئەوەی کەئەم دەسەڵاتە هەیە، دەبێت خاوەندارێتی تایبەتی هەبێت. هەڵوەشاندنەوەی ناکۆکی نێوان شارو لادێ یەکێکە لەسەرەتاییترین هەلومەرجی ژیانی هاوبەش، مەرجێك کەبەگوێرەی خۆی لەسەر کۆمەڵە مەفروزاتێکی مادی راوەستاوەو هەر بەو جۆرەی کەهەر کەسێك بەسەیرکردنێك دەتوانێت بیبینێت، ناتوانرێت تەنیا بەئیرادەی رووت جێبەجێ بکرێت. (ئەم هەلومەرجە دەبێت دواتر بەیان بکرێت) جیابوونەوەی شارو لادێ دەتوانرێت بەشێوەی جیایی سەرمایەو خاوەندارێتی زەوی، بەشێوەی سەرەتای پەیدابوون و گەشەی سەرمایەی سەر بەخۆ



لەخاوەندارێتی زەوی و سەرەتای خاوەندارێتییەکیش کە بنەماکەی تەنیا لەسەر کارو ئاڵوگۆڕ بێت، بناسرێتەوە.

لەو شارانەی کەلەسەدەکانی ناوەڕاستدا دروست کراون و ئامادەکراوی دەورەیەکی پێشوو نەبوون، بەڵکو بەهۆی رەعیەتە ئازادبووەکانەوە تازە دروست کرابوون، کاری تایبەتی هەر کەس، ئەوەندەی سەرمایەیەکی کەم کە لەگەڵ خۆیدا هێناویەتی و نزیکەی پێوستی ترین ئامرازە پیشەیەکانی دەگرێتەوە، بەتەنیا سامانی ئەو دەژمێردرا. ململانێی ئەو رەعیەتانەی کە بەبەردەوامی روویان دەکردە شار، شەڕی بەردەوامی لادێ لەدژی شارو بەمشێوەیە پێویستی هێزیکی سەربازی رێکخراوبووی شاری، پەیوەندی خاوەندارێتی هاوبەش لەجۆرێکی تایبەتی کار، پێویستی بەدامەزراوە هاوبەشەکان بۆ فرۆشتنی ئەو پیشەسازانەی کە کڕین و فرۆشتنیشیان دەکرد، وەلەدواجاردا دەرکردنی کەسە نەگونجاوەکان لەم دامەزراوانەدا، بەرەو روو بەرووبوونەوەی بەرژەوەندییەکانی نێوان پیشە جۆراو جۆرەکان، پێویستی پارێزگاری کردن لەو شارەزایەتییەی کەبەزەحمەت هاتبووە دەستیان و رێکخراوی فیودالی سەرانسەری وڵات ـ ئەمانە بوونە هۆی پێکهێنانی یەکێتی کرێکارانی هەر پیشەیەك لەرشتەکاندا. لەم باسەدا ئێمە نابێت زیاتر بچینە ناو گۆڕانکارییە پڕ لایەکانی سیستەمی رشتەیی، کە لەگەشە کردنی مێژوویی دواتردا پەیدابوو. هەڵاتنی رەعیەتەکان بۆ شارەکان لەسەدەکانی ناوەڕاستدا هەر بەو جۆرە بێ راوەستان درێژەی کێشا. رەعیەتەکان کەسەرباری بەدوادا گەڕاندنی خاوەنەکانیان لەلادێوە بەشێوەیەکی دابڕاوانە دەهاتنە شارەکانەوە، شوێنێك کەتیایدا لەگەڵ کۆمەڵێکی رێکخراودا بەرو روو دەبوونەوە کە لەبەرامبەریدا بێ توانابوون و بەناچاری دەبوایە شانیان بدایەتە بەر هەلومەرجێك کەبەهۆی داواکاری لەسەر کارەکانیان و بەرژەوەندییەکانی نەیارە رێکخراوبوەکانی شاریان بۆیان بڕابوەوە. ئەم کرێکارانە کە بەدابڕاوانە دەهاتنە شارەکانەوە، هەرگیز نەیان دەتوانی هێزێك بەدەست بهێنن، چونکە ئەگەر کاری

ئەوان لەجۆری رشتەیی و پێویستی بەفێربوون بوو، وەستای رشتەکان ئەوانیان دەخستە ژێر ئیرادەی خۆیانەوە و بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانی خۆیان رێکخراویان دەکردن. وەئەگەر کارەکانیشیان لەو جۆرە نەبوایە کەدەبوایە فێری بوونایەو بەناچاری لەجۆری رشتەیی نەبوایە، دەبوونە کرێکارانی رۆژکارو هیچ کاتێك نەیان دەتوانی رێکخراوبن، بەڵکو جەماوەرێکی عامەی نارێکخراو دەمانەوە. پێویستی بەکرێکارانی رۆژکار لەشارەکاندا، ئەم جەماوەرە بێ سەرو بەرەیەی دروست کرد.

ئەم شارانە "یەکێتییە" حەقیقییەکان بوون کە لەپێویستی راستەوخۆ بۆ دابین کردنی پاراستنی خاوەندارێتی و پارێزگاری لەخاوەندارێتی و زۆر کردنی هۆیەکانی بەرهەمهێنان و بەرگری لەئەندامە تاکەکان سەریهەڵدا بوو. جەماوەری عامەی ئەم شارانە هیچ هێزێکیان نەبووەو پێکهاتبوون لەکەسە لەیەکتر نامۆکان کە بەشێوەیەکی دابڕاوانە هاتبوونە شارو نارێکخراوانە لەبەرامبەر هێزێکی رێکخراو و ئامادە بەشەڕ کە شێلگیرانە بەدوایاندا دەگەڕان، وەستابوون. کرێکارانی شارەزا و شاگردان لەهەر پیشەیەکدا بەجۆرێك رێکخرا و کرابوون کە بەباشترین شێوە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی وەستاکاندا دەهاتەوە. پەیوەندی باوك سالارانە لەنێوان ئەوان و وەستاکاندا، توانایەکی دوو بەرابەری ئەدایە ئەوان: لەلایەکەوە بەهۆی نفوزێك کە ئەوان بەسەر تەواوی ژیانی کرێکارانی شارەزادا بەکاریان دەهێنا و لەلایەکی ترەوە بەهۆی ئەوەی کە بۆ ئەو کرێکارە شارەزایانەی کە لەگەڵ وەستایەکدا کاریان دەکرد، [ئەم پەیوەندییانە] پەیوەندییەکی واقعی بووە کە ئەوانی لەبەرامبەر کرێکارە شارەزاکانی سەرجەم وەستاکانی تردا بەیەکەوە دەبەستەوەو لەوانی جیا دەکردەوە. وە لەدواجاردا کرێکارانی شارەزا تەنانەت بەم ئومێدەوە کە رۆژێك خۆیان ببنە وەستا بەستراببوونەوە بەسیستەمەکەوە. بەم پێیە لەکاتێکدا جەماوەری عامە بەلانی کەمەوە لەدژی سەرجەم سیستەمی شاری دەخرۆشان، ئەو خرۆشانانەی کەبەهۆی بێ تواناییەوە



بەتەواوی بێ کاریگەر دەمانەوە، کرێکارانی شارەزا هیچ کات لەسنوری نافەرمانەتییە بچووکەکانی نا و رشتە جیاجیاکان، کەخۆی بەشێکە لەسروشتی رشتەیی، زیاتر نەڕۆشتن. راپەڕینە گەورەکانی سەدەکانی ناوەڕاست هەموویان لە لادێوە سەرچاوەیان دەگرت، بەڵام ئەمانیش بەهەمان ئەندازە بەهۆی گۆشەگیری و لەئەنجامدا نەخەملینی جووتیارانەوە بەتەواوی بێ کاریگەر دەمانەوە.

سەرمایە لەم شارانەدا یەك سەرمایەی بەشێوەی سروشتی گەشەکردو، پێکهاتوو لەیەك خانوو، ئامرازە پیشەیەکان و کڕیارە طبیعی‌یە بۆ ماوەیەکان بوو. وە بە لەبەرچا و گرتنی ئەوەی کە بەهۆی دواکەوتوویی ئاڵوگۆڕو دەستا و دەست پێ نەکردنەوە نەیدەتوانی بگۆڕێت بەپارە، ناچار دەبوایە لەباوکەوە بەجێبمێنێ بۆ کوڕ. بەپێچەوانەی سەرمایەی هاوچەرخەوە کە قابیلی قەبلاندنە بەپارەو دەتوانێت وەك یەك بخرێتە نا و ئەم یا ئەو شتەوە، ئەم سەرمایە راستەوخۆ بەکاری تایبەتی خاوەنەکەیدا پەیوەست بوو، لەو جیا نەدەبوەوەو لەم ئاستەدا سەرمایەکی رشتەیی بوو.

لەشارەکاندا دابەشبوونی کار لەنێوان بەشە جیاوازەکاندا هێشتا زۆر کەم گەشەی کردبوو، وە لەخودی بەشەکاندا لەنێوان یەك یەکی کرێکاراندا لەبنەڕەتدا بوونی نەبوو. هەر کرێکارێك دەبوایە لەجێبەجێ کردنی کۆمەڵێك لەکارەکاندا شارەزا و بەئەزموون بوایە، دەبوایە هەر شتێك کەدەیتوانی بەئامرازەکانی پێکی بهێنێ، دروست بکات. ئاڵوگۆڕی بەرتەسك و پەیوەندییە لاوازەکان کە لەنێوان شارە جۆراوجۆرەکاندا هەبوو، کەمی دانیشتوان و پێویستییە بەرتەسکەکان، رێگای بەدابەشبوونی کارێکی پێشکەوتووتر نەئەدا و هەر بۆیە هەر کەسێك کە دەیویست ببێتە وەستا دەبوایە لەهەموو پیشەکەی خۆیدا بەتەواوی رابهاتایە. هەر بۆیە پیشەسازانی سەدەکانی ناوەڕاست ئارەزوویان لەکاری تایبەتی خۆیان و وەرگرتنی هونەرەکەی، کە دەیتوانی تا ئەندازەی ئەهمیەتێکی هونەری بەرتەسکیش بەرز بێتەوە، هەبوو. لەهەمان کاتدا هەر لەبەر ئەمە هەر

پیشەسازێکی سەدەکانی ناوەڕاست کارەکەی خۆی بەکێشی دەکرد، لەپەیوەند بەوەوە ڕەزامەندییەکی کۆیلانەی وەر دەگرت و بەئاستێکی زیاتر لەکرێکارانی هاوچەرخ کەحەز لەکارەکەی ناکات، تیایدا دەتوایەوە.

## [3–دابەشبوونی زیاتری کار. جیابوونەوەی بازرگانی و پیشەسازی. دابەشبوونی کار لەنێوان شارە جۆراو جۆرەکاندا. مانیفاکتۆر]

بەرفراوانبوونی دواتری دابەشبوونی کار، جیابوونەوەی نێوان بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕو پێکهاتنی چینێکی تایبەتی بازرگانی بوو. جیابوونەوەیەك کە لەشارە بەجێماوەکانی دەورانی پێشوو، لەرابردووەوە مابووەوە (لەوانە هاوشان لەگەڵ یەهودییەکان) و لەشارە تازە دروستکراوەکانیشدا بەزوویی سەریدەرهێنا. هاوکات لەگەڵ ئەمەدا ئیمکانی پەیوەندییەکان بەبازرگانی دوورتر لەدراوسێ راستەوخۆکان پێکهات، ئیمکانێك کە جێبەجێ بوونەکەی بەستراببووەوە بە [چۆنیەتی] هۆیەکانی پەیوەندییەکانەوە، بەبوونی ئەمنیەتی گشتی لەلادێدا کە خۆی لەلایەن هەلومەرجی سیاسییەوە دیاریدەکرا (زانراوە کەلەسەدەکانی ناوەڕاستدا بازرگانەکان لەگەڵ کاروانە چەکدارەکاندا سەفەریان دەکرد) وەبەپێویستە سەرەتایی یا پێشکەوتووەکان (مەرپووت بەقۆناغێکی فەرهەنگی ناوچەیەك کەئەم ئاڵوگۆڕە لەگەڵ ئەودا پێکدەهات.

بەنەمانی ئاڵوگۆڕ بەچینێکی تایبەتەوە، لەگەڵ فراوانبوونی بازرگانی لەنێوان بازرگانەکانی دەرەوەی چواردەوری شار، بێ وەستان کارێکی دوو لایەنە لەنێوان بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕدا دەرکەوت. شارەکان پەیوەندییان لەگەڵ یەکتریدا دەگرت، ئامرازە نوێکان لەشارێکەوە بۆ شارێکی تر دەهێنران و جیابوونەوەی نێوان بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕ بەخێرایی دابەشبوونێکی نوێی بەرهەمهێنانی لەنێوان شارە جۆراو جۆرەکان، کە هەرکامەیان بەخێرایی رشتەیەکی زاڵیان



لەپیشەسازیدا دەخستە خزمەت خۆیانەوە، پێکدەهێنا. بەرتەسکییە ناوچەیەکانی دەورانی سەرەتایی وورده وورده لەبەر یەك هەڵدەوەشایەوە.

ئەوەی کە هێزە بەرهەمهێنەرە گەشە کردووەکان لەسنورێکی ناوچەییدا، بەتایبەتی داهێنانەکان گەشە کردنی دواتر پێکدەهێنن یا لەنا و دەچن، رێك بەستراوەتەوە بەفراوانبوونی ئاڵوگۆڕەوە. لەبەر ئەوەی ئاڵوگۆڕێك کە لەدراوسێ نزیکەکان زیاتر تێپەڕێت بوونی نییە، دەبێت هەر داهێنانێك لەهەر سنورێکی ناوچەییدا بەشێوەیەکی جیا ئەنجام بدرێت و بەتەنیا رێکەوتنێکی لەچەشنی هێرشە خوێناویەکانی خێڵە وەحشییەکان، تەنانەت شەڕە ئاساییەکان، بەسە تا وولاتێکی خاوەن هێزەکانی بەرهەمهێنان و پێویستییەکانی پێشکەوتن ناچار بکات کە سەر لەنوێ لەسەرەتاوە دەست پێبکەنەوە. لەمێژووی سەرەتاییدا هەر داهێنانێك دەبوایە هەر رۆژەو لەهەر سنورێکی ناوچەییدا بەشێوەیەکی جیا وازانە سەرلەنوی پێکبێتەوە. ئەمەی کەتەنانەت لەبازرگانییەکی تارادەیەك زۆر فراوانیشدا هێزە بەرهەمهێنەرە زۆر گەشە کردووەکان لەتیاچوونی تەواوێتی پارێزراو نین، بەمەسەلەی فینیقیەکاندا دەسەلمێت کە بەشێکی گەورەی داهێنانەکانیان بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ بەهۆی دەست کورتی ئەم نەتەوەیە لەبازرگانیدا، دەست بەسەراگرتنی ئەوانە لەلایەن ئەسکەندەرو لەبەر یەك هەڵوەشاندنەوەکانی دواتر، لەدەست چوو. رەنگ کردنی شووشە لەسەدەکانی ناوەڕاستیشدا نموونەیەکی لەو جۆرەیە. تەنیا کاتێك ئاڵوگۆڕ دەبێتە ئاڵوگۆڕێکی جیهانی و لەسەر پایەی پیشەسازی گەورە پێك بێت، ئەو کاتەی تەواوی نەتەوەکان راکێشرابێتنە ناو تێکۆشانێکی ململانەیی، ئەو کاتەیە کەتەمەن درێژی هێزە بەرهەمهێنەرە بەدەست هاتووەکان داین دەکرێت.

ئەنجامی بێ چەندو چۆنی دابەشبونی کار لەنێوان شارە جۆراجۆرەکاندا، سەر دەرهێنانی مانیفاکتۆرەکان، واتە ئەو لایەنانەی بەرهەمهێنان بوو کە زیاتر لەسیستەمی رشتەیی گەشەیان کردبوو. ئاڵوگۆڕ لەگەڵ باقی نەتەوەکاندا پێش

مەرجی مێژوویی نەشونمای سەرەتایی مانیفاکتۆرەکان، لەئیتالیا و دواتر لە فلاندەر، بوو. لەسەرجەم وولاتەکاندا، بۆ نموونە لەئینگلستان و فەرەنسا، مانیفاکتۆرەکان لەسەرەتادا لەبازاڕی ناوخۆییدا قەتیس مابوونەوە. جیا لەو فەرزیاتانەی کە ئێستا باسیان کرا، مانیفاکتۆرەکان پێویستی بەبوونی چەقبەستنێکی پێشکەوتوو لەدانیشتوان، بەتایبەتی لەلادێدا و چەقبەستنی سەرمایە بوو کە لەدەستی چەند کەسێکدا، هەندێکیان لەرشتەکاندا و بەپێچەوانەی یاسا رشتەیەکان و هەندێکیان لەنێوان بازرگانەکاندا، دەستیان بەکەڵەکە بوون کردبوو.

ئەو جۆرە لەکار کە هەر لەسەرەتاوە پێویستی بەئامێر، تەنانەت لەسەرەتاییترین جۆری ئەو بوو، بەزوویی دەریخست کە زیاد لەهەموویان توانای بەرەو پێش چوونی هەیە. چنین کە لەرابردوودا وەك کارێکی لاوەکی لەلایەن جووتیارانەوە بۆ دابینکردنی جلو بەرگەکانیان ئەنجامیان ئەدا، یەکەمین کارێك بوو کە لەرێگای بەرفراوان بوونی ئاڵوگۆڕەوە جوڵەو گۆڕانێکی بەسەردا هات. چنین یەکەمین مانیفاکتۆرە بوو، وە وەك سەرەکی ترینیشیان مایەوە. زۆر بوونی داخوازی لەسەر پارچەی قوماش لەئەنجامی زۆر بوونی دانیشتوان، کەڵەکەو جوڵانی روو بەگەشەو بەکار هێنانی سەرمایەی سروشتی لەرێگای هات و چۆی خێرا و داخوازی بۆ کالا ئارایشییەکان کە لەم رێگایەوە هاتبووەدی و بەشێوەیەکی زۆر لەلایەن بەرفراوانبوونی ئاڵوگۆڕەوە هان ئەدرا، جوڵەیەکی چەندایەتی و چۆنایەتی دا بەچنین کە ئەوی لەوشێوە بەرهەمهێنانەی کە تا ئەو کات هەبوو هێنایە دەرەوە. لەپاڵ ئەو جووتیارانەی کە بۆ بەکارهێنانی خۆیان کاری چنینیان دەکرد، ئەو جووتیارانەی کە هەروەها درێژەیان بەم جۆرە کارە ئەدا و هێشتاش ئەیدەن، چینێکی نوێ لەجۆلاکان لەشارەکاندا دەرکەوت کە چنراوەکانیان روو لەهەموو بازاڕی ناوخۆیی و بەگشتیش بازاڕە دەرەکیەکان بوو.



چنین، کارێك زۆر جار پێویستی بەشارەزاییەکی کەم هەیەو بەزوویش دابەش دەبوو بەسەر لقێکی زۆردا، بەتەواوی بوونییەوە لەبەرامبەر رێگری رشتەییدا بەرگریدەکرد. هەر بۆیە چنین زیاتر لەلادێکان و لەشوێنی بازاڕەکان، کەرێکخراوی رشتەییان نەبوو، ئەنجام ئەدرا و ئەم جێگایانە وورده وورده بەشارو لەراستیدا گۆڕان بەشکۆمەندەترین شارەکان لەهەر وولاتێکدا.

لەگەڵ مانیفاکتۆری ئازاد بوو لەرشتەکان، پەیوەندییەکانی خاوەندارێتیش بەخێرایی گۆڕا. یەکەمین پێشکەوتنی زیاتر لەسەرمایەی رشتەییدا کە بەشێوەیەکی سروشتی هاتبووە دی، بەدەرکەوتنی بازرگانەکان بەدەست هات. سەرمایەی ئەم بازرگانانە لەهەمان سەرەتای گوێزانەیەوە، سەرمایە بوو بەمانا هاوچەرخەکەی، هەڵبەتە تا ئەو شوێنەی کە کەسێك بە لەبەرچاوگرتنی هەلومەرجی ئە و رۆژگارە دەتوانێت دەربارەی وەها شتێك قسەبکات. دووەمین پێشکەوتن لەگەڵ مانیفاکتۆرەدا پێکهات کە سەر لەنوێ قەبارەیەکی فراوانی لەسەرمایەی سروشتی بەکارهێنا و بەگشتی قەبارەی سەرمایەی گوێزراوەی لەبەراورد لەگەڵ سەرمایەی سروشتیدا زیادکرد.

لەهەمان کاتدا مانیفاکتۆرە بووە پەناگایەك بۆ جووتیاران لەدەست ئەو رشتانەی کە ئەوانیان دەردەکردو یا کرێی کەمیان پێئەدان، رێك بەهەمان شێوە کە لەرابردوودا شارە رشتەییەکانیان وەك پەناگایەك بۆ جووتیاران لەدەست خاوەن زەویدارەکان بەکار هاتبوو.

هاوکات لەگەڵ دەست پێکردنی مانیفاکتۆرەدا، لەئەنجامی هەڵوەشاندنەوەی دام و دەزگای بەکرێگیراوان و خزمتکارانی فیودالی، لەبەریەك هەڵوەشاندنەوەی ئەو سوپایانەی لەجەماوەرێکی جۆراو جۆر پێکهاتبوون کە یارمەتی پاشاکانی ئەدا لەبەرامبەر ئەو پارچە زەوییەی کە پێیان درابوو، باشبوونی کشتوکاڵ و گۆڕینی پارچە زەوییە فراوانەکانی چاندن بە لەوەرگاکان دەورەیەك لەماڵ بەکۆڵی و وێڵی هات. لەهەمان خاڵدا بەتەنیایی روونەبێتەوە کە بەچ جۆرێك ئەم وێڵبوونە رێك

بەستراوەتەوە بەهەڵوەشاندنەوەی سیستەمی فیودالی. هەر لە سەدەی سێزدەهەمیشدا ئێمە ناوە ناوە دەورانێکی لەم جۆرەمان هەیە، بەڵام تەنیا لەکۆتایی سەدەی پانزەهەمو سەرەتای سەدەی شانزەهەمدایە کە ئەم ماڵ بەکۆڵیو وێڵییە بووە دیاردەیەکی گشتیو بەردەوام. ئەم وێڵانە کە ژمارەیان ئەوەندە زۆر بوو بۆ نموونە هنری هەشتەمی پاشای ئینگلستان 72000 کەسی لەوانە لەسێدارەدا، تەنیا بەزۆرترین دژواریو لەرێگای پێویستی لەرادەبەدەرو ئەویش لەدوای بەرگرییە درێژخایەنەکان ملیان بەکاردا. گەشەی خێرای مانیفاکتۆرەکان، بەتایبەتی لەئینگلستان، وورده وورده ئەوانی بەلای خۆیدا راکێشا.

لەگەڵ دەستپێکردنی مانیفاکتۆرەدا نەتەوە جۆراو جۆرەکان چوونە ناو پەیوەندییەکی ململانێیو خەباتێکی بازرگانییەوە، کەلەرێگای جەنگەکان، باجە زۆرەکانی بەرپێگرتنو قەدەغە کردنەکانەوە بەرەو پێشەوە دەبرا، لەکاتێکدا پێشتر نەتەوەکان، بەو جۆرەی ئەسڵەن لەپەیوەندیەکاندا بوون، ئاڵوگۆڕێکی بێ بەرەو روو بوونەوەیان هەبوو. لەم کاتە بەدواوە بازرگانی گرنکییەکی سیاسی پەیداکرد.

لەگەڵ دەرکەوتنی مانیفاکتۆرەدا پەیوەندییەکانی نێوان کرێکارو خاوەن کار گۆڕانکاری بەسەرداهات. لەرشتەکاندا پەیوەندییە باوك سالارەکان لەنێوان کرێکارو وەستادا هەر بەو جۆرە درێژەی کێشا. لە مانیفاکتۆرەدا پەیوەندییە پارەیەکانی نێوان کرێکارو سەرمایەدار جێگای ئەوی گرتەوە. پەیوەندییەك کە لەلادێو شارە بچووکەکاندا سیمایەکی لەباوك سالاری پاراست، بەڵام لەشارە گەورەکانیتردا، شارە بەراستی مانیفاکتۆریەکان، زۆر زوو سەرجەم تایبە تمەندی باوك سالارانەی خۆی لەدەستدا.

مانیفاکتۆرو حەرەکەتی بەرهەمهێنان بەشێوەیەکی گشتی، لەگەڵ فراوانبوونی ئاڵوگۆڕکە شان بەشانی دۆزینەوەی ئەمریکا و رێگای دەریایی بۆ هندستانی



رۆژهەڵات دەرکەوت، بزوێنەرێکی زۆر بەهێزی دەستکەوت. بەرهەمە نوێکان کە لەوێوە دەهێنران. بەتایبەتی ئاڵتونو زێڕێکی زۆر کە هاتە ناو رەوەندەکەوە، جێگا ورێگای چینەکانی سەبارەت بەیەکتر بەتەواوی گۆڕیو گورزێکی سەختیدا لەخاوەندارێتی زەوی فیودالیو لەکرێکاران. رەوانە کردنی مەغامەرەچییەکان، دروست بوونی کۆچنشینەکانو زیاتر لەهەموو ئەمانە گەشەو گۆڕینی بازاڕەکان بەبازاڕێکی جیهانی، کە ئێستا مەیسەر بووەو رۆژ بەرۆژ زیاتر دەبووە واقعیەتێك، قۆناغێکی نوێی لەگەشەکردنی مێژوویی هێنایەدی، کە لێرەدا پێویست بەزیاتر چوونە ناویەوە ناکات. دروست بوونی کۆچنشینەکان لەووڵاتە تازە دۆزراوەکاندا ئاگری تێکۆشانی بازرگانی لەنێوان نەتەوەکاندا هەڵگیرساندو بەم شێوەیە بەرفراوانییەکی زیاترو گورجییەکی زیاتری پێبەخشی.

بڵاوبوونەوەی بازرگانیو مانیفاکتۆر، کەڵەکە بوونی سەرمایەی گوێزراوەی خێراتر کرد، لەکاتێکدا لەشتەکاندا، کە هۆیەکیان بۆ گەشەی بەرهەمهێنانەکانیان دەست نەکەوتبوو، سەرمایەی سروشتی بەڕاوەستاوی مایەوە، وەیا تەنانەت بەرەو تیاچوون چوو. بازرگانیو مانیفاکتۆر بورژوازی گەورەیان پێك هێنا. لەرشتەکاندا وورده بورژوازی چەقی بەست کە ئیتر وەك رابردوو لەشاردا جێگا ورێگایەکی زاڵی نەبوو، بەڵکو بەناچاری دەبوایە ملی بدایە بەهێزی بازرگانی گەورەو خاوەن مانیفاکتۆرەکان[*]. بەم جۆرە بوو کە رشتەکان، بەتەنیا ئەوەی کە پەیوەندییان لەگەڵ مانیفاکتۆرەکاندا گرت، بەرەو تیاچوون چوون.

لەدەورانێکدا کە لەبارەیەوە قسە دەکەین، پەیوەندی نێوان ووڵاتەکان لەئاڵوگۆڕەکانیاندا دوو شکڵی جیاوازی بەخۆیەوە گرت. لەسەرەتادا کەمی قەبارەی ئاڵتونو زێڕ لەسوڕاندا بووە هۆی قەدەغەکردنی دەرچوونی ئەم کانزانە. وەپیشەسازی کە بەهۆی پێویستی بەبەکارهێنانی دانیشتوانی روو لەزیادی شار ببووە پێویستییەكو بەزۆری لەدەرەوە دەهێنران، نەیدەتوانی بەبێ ئیمتیازێك کە

---

[*] -[نووسینی پەراوێز لەلایەن مارکس:] وورده بورژوازی -چینی ناوەڕاست- بورژوای گەورە.

بێگومان نەتەنیا لەبەرامبەر ململانێی ناوخۆییدا بەڵکوو بەگشتی لەبەرامبەر ململانێی دەرەوەدا دەبەخشرا، بەردەوام بێت. لەم قەدەغە کردنە سەرەتایانەدا، ئیمتیازاتی رشتەیی ناوچەیی سەرانسەری وولاتی گرتەوە. داهاتی گومرگی لەو باجانەوە سەرچاوەیان دەگرت کە خاوەنداره فیودالەکان لەپاداشتی بەرگری لەبەرامبەر ئەو رێگرانە، کە بازرگانەکان بەسەر زەوی ئەواندا تێدەپەڕین، لێیان دەساندن، ئەو باجانەی کە دواتر بەهەمان شێوە لەلایەن شارەکانیشەوە دانران و بەدەرکەوتنی دەوڵەتە هاوچەرخەکان بووە ئاساییترین هۆی کۆکردنەوەی پارە بۆ خەزنەدارەکان.

دەرکەوتنی ئاڵتون و زێڕی ئەمریکایی لەبازاڕە ئەورووپییەکاندا، گەشەی ووردە ووردەی پیشەسازی، فراوانبوونی خێرای بازرگانی و دەرکەوتنی دواتری بورژوازییە نارشتەیەکان و گرنگی زۆری پارە، گرنگییەکی نوێی بەخشییە ئەم کارانە. دەوڵەت، کە رۆژ بەرۆژ کەمتر دەیتوانی بەبێ پارە بەردەوام بێت، ئێستا قەدەغە بوونی دەرچوونی ئاڵتون و زێڕی بەگوێرەی لەبەرچاوگرتنە داراییەکان دەپاراست. بورژواکان، کە ئەم بڕە پارانەی کەدەخرایە بازاڕەوە،بۆیان ببووە بابەتێکی گشتی معامەلەی حەواڵەییانە، لەم کارەدا بەتەواوی خۆشحاڵ ببوون. ئیمتیازە سەپاوەکانی پێشوو ببوە سەرچاوەیەکی داهات بۆ دەوڵەت و لەبەرامبەر پارەدا دەفرۆشران. لەیاسا داڕێژییەکانی گومرگیدا دیاردەی باجی زۆری ناردنە دەرەوە پەیدا بوو کە بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە رێک بەری بەگەشەی پیشەسازی دەگرت، مەبەستێکی دارایی هەبوو.

دەورەی دووەم لەنیوەی سەدەی هەڤدەیەمدا دەستپێیکردو تانزیکەی کۆتایی سەدەی هەژدەهەمی خایاند. بازرگانی و کەشتییەوانی خێراتر لە مانیفاکتۆر کە دەورێکی لاوەکی دەبینی، فراوان ببوون. کۆچنشینەکان ببوونە مەسەرەف کەرە بەرچاوەکان، وە لەدوای ململانێ دوورو درێژەکان وولاتە جۆراو جۆرەکان بازاڕی جیهانی روو لەفراوان بوویان لەنێوان خۆیاندا دابەشکرد. ئەم دەورەیە



بەیاساکانی کەشتییەوانی و کۆنترۆڵی کۆلۆنیالی دەستپێدەکات. بەهۆی گومرگ و قەدەغە کردنەکان و پەیمانەکانەوە ئەوەندەی لەتوانادا بوو بەر بەململانێی نێوان وولاتەکان دەگیرا. وە لەدواجاردا، جدالی ململانێ لەرێگای جەنگەکان (بەتایبەتی جەنگە دەریاییەکان) بەرەو پێشەوە دەبرا و لە رێگایەوە تەکلیفی خۆی دیاریدەکرد. بەهێزترین نەتەوەی دەریاوان، نەتەوەی ئینگلیز، بالادەستی خۆی لە بازرگانی و مانیفاکتۆرەدا پاراست. لێرەدا ئێمەش ئێستا چەقبەستن لە وولاتێکدا دەبینین.

مانیفاکتۆر هەمیشە لەبازاڕی ناوخۆییدا بەهۆی باجە زۆرە بەرگریەکانەوەو لەبازاڕە داگیرکراوەکان بە ئیحتیکارو لەدەرەوە تا ئەوەندەی ئیمکانی هەبوو لەلایەن باجە جیاکەرەوەکان30 دەپارێزرا. دروستکردنی کەرەسەی بەرهەمهاتوو لەناوخۆ (خوری و کەتان لەئینگلستان و ئاوریشم لەفەرەنسا) هان ئەدرا، ناردنە دەرەوەی کەرەسەی خاوی بەرهەمهاتوو لەناوخۆدا (خوری لەئینگلستان) قەدەغە بوو، وەدروستکردنی کەرەسەی خاوی هاتوو (لۆکە لەئینگلستان) پشت گوێ دەخرا یان دەخرایە ژێر فشارەوە. نەتەوەیەك کە لەبازرگانی دەریایی و هێزی داگیرکردندا بالا دەست بوو بێگومان زۆرترین فراوانبوونی چەندایەتی و چۆنایەتی لەمانیفاکتۆری بۆ خۆی دابیندەکرد. مانیفاکتۆر نەیدەتوانی بەبێ پشتیوانی بەردەوام بێت، چونکە بەهۆی بچووك ترین گۆڕانکاری لەوولاتانی تردا لەوانەبوو بازاڕی خۆی لەدەست بدات و لەنێو بچێت. لەژێر هەلومەرجێکی تارادەیەك لەباردا دەیتوانی بەسادەیی لەوولاتێکدا جێگیر بێت، بەلام رێك بەهۆی ئەمەوە لەوانەبوو بەسادەیش لەناوبچێت. لەهەمان کاتدا شێوەی بەرهەمهێنانی مانیفاکتۆری، بەتایبەتی لەسەدەی هەژدەهەم لەناوچە لادێیەکاندا، بەرادەیەك لەگەڵ هەلومەرجی ژیانی جەماوەرێکی فراوان لەکەسەکاندا تێکەڵ ببوو کە هیچ وولاتێك نەیدەوێرا بوونی ئەوانە بەقبوڵکردنی ململانێی ئازاد بخاتە مەترسییەوە. لەئەنجامدا مانیفاکتۆر تائەو شوێنەی کەتوانای ناردنە دەرەوەی هەبوو، بەتەواوی

وابەستە بوو بەگەشە یان بەرتەسکی بازرگانییەوە و خۆی لەبەرامبەردا کاریگەرییەکی زۆر کەمی لەسەر ئەو هەبوو. دەوری لاوەکی مانیفاکتۆرو نفوزی بازرگانی لەسەدەی هەژدەیەمدا لێرەدایە. بازرگانەکان و بەتایبەتی خاوەن کەشتییەکان بوون کە زیاتر لەهەر کەسێکی تر زەحتیان بۆ بەدەست هێنانی سەر پشتیوانی حکومەتی و ئیحتیکارەکان دەهێنا. خاوەن مانیفاکتۆرەکانیش خوازیاری پشتیوانی بوون و لەراستیدا ئەوەیشیان بەدەست دەهێنا، بەڵام لەرووی گرنگی سیاسییەوە سەبارەت بەبازرگانەکان لەخوارەوەتر بوون، شارە بازرگانیەکان، بەتایبەتی شارە دەریاییەکان، تائاستێك شارستانی بوون و روانگەی بورژوازی گەورەیان بەدەستەوە گرت، بەڵام لەشارە کارخانەییەکاندا روانگەیەکی تاسەر ووردە بورژوازی لەجێی خۆیدا مایەوە. بگەڕێرەوە سەر "ئایکین". سەدەی هەژدەیەم سەدەی بازرگانی بوو. پینتو ئەمە بەروونی بەیان دەکات "بازرگانی شێتی ئەم سەدەیەیە"و :"لەماوەیەك لەمەوپێش تەنیا مەسەلەیەك کە لەئارادایە، بازرگانی، کەشتیەوانی و هێزی دەریاییە".

حەرەکەتی سەرمایە، گەرچی بەشێوەیەکی بەرچاو خێرا ببوو، لەگەڵ سەرجەم ئەمانەشدا هەروا بەو جۆرە بەسستی مایەوە. دابەشبوونی بازاڕی جیهانی بەبەشە جیاجیاکان کە هەرکامیان لەلایەن وولاتێکەوە سوودی لێوەر دەگیرا، رێگرتن لەململانێی نێوان وڵاتە جیاوازەکان، پێش نەکەوتنی بەرهەمهێنان و ئەو راستیەی کە هێشتا دارایی قۆناغی سەرەتایی گەشەکردنی خۆی تێدەپەڕاند، بەئەندازەیەکی زۆر گەڕانی سست دەکرد. ئەنجامی ئەمە رۆحیەتی چەنەبازی و چروکی و رەزیلییەك بوو کەهێشتا دەستی خستبووە سەر هەموو بازرگانەکان. بازرگانەکان لەبەراورد لەگەڵ خاوەن مانیفاکتۆرەکاندا و بەتایبەتی لەگەڵ پیشەسازانی دەستیدا، بێگومان بورژوا گەورەکان بوون. بەڵام لەبەراورد لەگەڵ بازرگانەکان و خاوەن پیشەسازیەکانی دەورەی دواتردا، جیا لەووردە بورژواکان هیچی تر نەبوون. بگەڕێرەوە سەر ئادەم سمیث.



ئەم دەورەیە هەر بەوجۆرەی بەهەڵوەشاندنەوەی قەدەغەکردنەکانی ناردنە دەرەوەی ئاڵتون وزێڕو دەستپێکردنی بازرگانی پارە، بانقەکان، قەرزە میللییەکان، چەك، مەعامەلە بەوەرەقە قەرزییەکان و سەهمەکان، مەعامەلە بەهەموو شتومەکەکان و گەشەی دارایی بەشێوەیەکی گشتی، دیاریدەکرێ. جارێکیتر سەرمایە بەشێکی گەورەی لەو تایبە تمەندییە سروشتییەی کە هێشتا چنگی لێگیر کردبوو لەدەستدا.

## [4–بەرفراوانترین دابەشبوونی کار. پیشەسازی گەورە]

چەق بەستنی بازرگانی و مانیفاکتۆر لەیەك وڵاتدا، واتە ئینگلستان، کە لەسەدەی هەڤدەهەمدا بەجۆرێکی بەرپێ نەگیراو لەحاڵەتی پێشڕەویدا بوو، وورده وورده بازاڕێکی کەم تا زۆر جیهانی بۆ ئەو وڵاتە پێکهێنا و بەم شێوەیە داخوازییەکی بۆ بەرهەمە پیشەسازییەکانی ئەم وولاتە دروست کرد کە ئیتر توانای پێکهێنانی ئەوە لەلایەن هێزەکانی بەرهەمهێنانی تا ئەوکاتەوە نەبوو، ئەم داخوازییە، کە زیاتر لە ئاستی هێزە بەرهەمهێنەرەکان بەرەو پێشەوە چووبوو، بووە هێزێکی جوڵێنەر کە لەگەڵ دروستبوونی پیشەسازی گەورە –واتە بەکارهێنانی هێزە سروشتییەکان بۆمەبەستی پیشەسازی، ئامێرو فراوانترین جۆری دابەشبوونی کار. سێیەمین دەورەی خاوەندارێتی تایبەتی لەدوای سەدەکانی ناوەڕاست پێکهێنا. پێش مەرجەکانیتری ئەم قۆناغە نوێیەش لەو کاتەدا لەئینگلستان پێکهاتبوو: ئازادی ململانێ لەناو خۆی وولاتدا، پێشکەوتنی میکانیکی نەزەری و هتد (لەراستیدا میکانیك کە بەهۆی نیوتنەوە سەروسامانی پێدرا بوو، لەکۆی باوترین زانستەکانی فەرەنسا و ئینگلستانی سەدەی هەژدەیەم بوو). (ململانێی ئازاد لەناو خۆی خودی وڵاتدا لەهەموو شوێنەکاندا ئەبوایە بەهۆی شۆڕشەوە بەدەست بهاتایە – 1640و 1688 لە ئینگلستان، 1789 لەفەرەنسا).

ململانێ بەخێرایی هەر وڵاتێك، كە دەیویست دەوری مێژوویی خۆی بپارێزێت، ناچاركرد كەمانیفاكتۆرەكانی خۆی بەهۆی دانانی بڕیارە گومرگییە نوێكانەوە بپارێزێت (پشتیوانییە گومرگییە كۆنەكان ئیتر لەبەرامبەر پیشەسازی گەورەدا بێ كەڵك بوون) وەلەدوای ئەوە لەژێر سێبەری دانانی بەرگرییەكانەوە بەخێرایی دەستبەرن بۆ پێكهێنانی پیشەسازی گەورە. سەرباری ئەم كارە بەرگرییانە، پیشەسازی گەورە ململانێیی جیهانگیرانە كرد (ململانێیی جیهانی بەكردەوە هەمان بازرگانی ئازادە. بڕیارە بەرگرییەكان تەنیا یەك خانوو، یەك هەنگاوی بەرگرییە لەچوارچێوەی بازرگانی ئازاددا)، ئامرازەكانی پەیوەندیی و بازاڕی جیهانی نوێیی پێكهێنا، بازرگانی خستە ژێر دەستی خۆیەوە، سەرجەم سەرمایەی گۆڕی بەسەرمایەی پیشەسازیی و بەمشێوەیە بەهاتو چۆی خێرای سەرمایە (گەشەسەندنی سیستەمی مالی)و چەقبەستنی سەرمایەی هێنایە دی. پیشەسازی گەورە لەرێگای ململانێیی جیهانییەوە سەرجەم فەردەكانی ناچاركرد تەنیا پشت بەلانی زۆری تواناییەكانی خۆیان ببەستن. ئایدیۆلۆژی، دین، ئەخلاقو ...هتدی تا ئەو ئاستە كە بۆی كرا لەناوبردو لەهەر شوێنێك كەنەیتوانی ئەو كارە بكات، ئەوانەی كردە درۆیەكی ئاشكرا. پیشەسازی گەورە بۆ یەكەم جار مێژووی جیهانی هێنایەدی، بەم مانایەی كە تەواوی نەتەوە پێشكەوتووەكانو هەر تاكێكی ئەندامی ئەوانی بۆ بەدەستهێنانی پێویستییەكانی بەستەوە بەسەرجەم جیهانەوەو بەمشێوەیە لەخۆدا قەتیس مانەوەی سروشتی نەتەوە جۆراو جۆرەكانی لەناو برد. زانستی سروشتی خستە خزمەت سەرمایەوەو دوا رەگەكانی خەسڵەتی سروشتی لەدابەشبوونی كار ساندەوە. تایبە تمەندی سروشتی كاری، تائەو شوێنەی كە ئەم كردارە لەبارەی كارەوە مومكینە، لەناو بردو هەموو پەیوەندییە سروشتییەكانی لە پەیوەندییە پارەییەكاندا تواندەوە. لە جێگای ئەو شارانەی كە بەشێوەیەكی سروشتی گەشەیان كردبوو، شارە پێشكەوتووەكانو گەورە پیشەسازییەكان كە یەك شەوە



سەریان هەڵدا بوو پێكهێنا. پیشەسازی گەورە لەهەر جێگایەكدا دەسەڵاتی كەوتە دەست، پیشەكانو هەموو قۆناغەكانی پیشەسازی پێشووی لەناو برد. سەركەوتنی شاری بەسەر لادێدا تەواو كرد. بنەمای ئەو سیستەمێكی ئۆتۆماتیكییە. پیشەسازییەكی گەورەی جەماوەری وەهای لەهێزەكانی بەرهەمهێنان دروستكرد كە خاوەندارێتی تایبەتی بۆ ئەو رێك ئەوەندە ببوە قەیدو بەند كە رشتەكان بۆ مانیفاكتۆرو كارگە بچووكەكانی لادێ بۆ پیشەسازی دەستی روو بەگەشە ببوونە قەیدو بەند. ئەم هێزە بەرهەمهێنەرانە لەژێر سیستەمی خاوەندارێتی تایبەتیدا تەنیا گەشەكردنێكی یەك لایەنە پەیدا دەكەن، و بۆ زۆربەیان دەبنە هێزە وێرانكەرەكان. جیا لەمە بەشێكی زۆری ئەم هێزانە لەژێر سیستەمی خاوەندارێتی تایبەتیدا ئەسڵەن كارێك پەیدا ناكەن. بەشێوەیەكی گشتی پیشەسازی گەورە لەهەموو شوێنێكدا پەیوەندییە لەیەك چووەكانی لەنێوان چینەكانی كۆمەڵدا دروستكرد، و بەم شێوەیە خەسڵەتی تایبەتی نەتەوە جۆراو جۆرەكانی لەناو برد. وەسەرەنجام لەكاتێكدا بورژوازی هەر وڵاتە هێشتا بەرژەوەندی جیاوازی نەتەوەیی دەپاراست، پیشەسازی گەورە چینێكی دروست كرد كە لەهەموو وڵاتەكاندا بەرژەوەندی وەك یەكی هەیە، وە بۆئەو نەتەوە ئیتر مردبوو. چینێك كە لەراستیدا بەتەواوی لەدنیای كۆن رزگاری بووەو لەهەمان كاتدا پایەدارانە لەدژی رادەوەستێت. لەروانگەی كرێكارەوە، پیشەسازی گەورە نەتەنیا پەیوەندی ئەو لەگەڵ سەرمایەدار، بەڵكو خودی كاریش بۆ كرێكاران تەحەمول نەكراو دەكات.

ئاشكرایە كە پیشەسازی گەورە لە هەموو ناوچەكانی یەك وڵاتدا ناگاتە ئاستێكی گەشەكردووی وەك یەك. بەڵام ئەمە حەرەكەتی چینایەتی پڕۆلیتاریا دوا ناخات، چونكە ئەو پڕۆلیتاریایانەی كە دروستكراوی پیشەسازی گەورەن رابەرایەتی ئەم راپەڕینە دەگرنە دەستو تەواوی جەماوەر لەگەڵ خۆیاندا بەرەو پێشەوە دەبەنو بەهۆی ئەوەیشەوە كە كرێكارانی دەرەوەی پیشەسازی گەورە

لەوەزعێکی تەنانەت خراپتر لەخودی پیشەسازی گەورەدان. ئەو وڵاتانەی کە پیشەسازی گەورە تیایاندا گەشەی کردووە، لەبەرامبەر ووڵاتە ناپیشەسازییەکان، بەئاستێك کە ئەوان لەلایەن ئاڵوگۆڕی نێونەتەوەییەوە بۆ خەباتێکی ململانێ ئامێزی جیهان راکێشرابێتن، بەشێوەیەکی وەك یەك دەجوڵێنەوە.

*　　　*　　　*

ئەم شێوە جۆراو جۆرانەی بەرهەمهێنان، هەمان شێوە جۆراو جۆرەکانی رێکخراوبووی کارو لەئەنجامدا شێوە جۆراو جۆرەکانی خاوەندارێتین. لەهەر دەورەیەکدا، [شێوەیەك لە] یەکبوونی هێزە بەرهەمهێنەرەکان ، تا ئەو شوێنەی کە ئەم کارە بەهۆی پێداویستییەکانەوە، پێویست بێت، پێك دێن.

## [5_ناکۆکی نێوان هێزە بەرهەمهێنەرەکانوشێوەی ئاڵوگۆڕ وەك بنەمایشۆڕشی کۆمەڵایەتی]

ناکۆکی نێوان هێزە بەرهەمهێنەرەکان و شێوەی ئاڵوگۆڕ کە وەك بینیمان چەندان جار لە مێژوودا، هەر چەندە بێ ئەوەی پایەکانی خۆی بخاتە مەترسییەوە رووی داوە، وەك پێویست لەهەر دەورانێکدا بەشێوەی شۆڕشێك سەریهەڵداوەو لەهەمان کاتدا شێوە شوێنکەوتییە جۆراو جۆرەکانی وەك بەرەو رووبوونەوە گشت گیرەکان، بەرەو رووبوونەوە چینایەتییە جۆراو جۆرەکان، ناکۆکییەکانی هووشیاری، جەنگی ئەندێشەکان، خەباتی سیاسیو هتد...ی بەخۆوە گرتووە. لەروانگەیەکی بەرتەسکەوە ئینسان دەتوانێت یەکێك لەم شێوە شوێنکەوتییە جیا بکاتەوەو ئەوە وەك بنەمای ئەم شۆڕشانە لەبەرچاو بگرێت. ئەم کارە هەم ئاسانترە چونکە کەسانێك کە شۆڕشەکانیان هەڵگیرساندووە، هاوشانی ئاستی فەرهەنگیو قۆناغی گەشەی مێژوویییان، لەبارەی چالاکییەکانی خۆیانەوە وەهمیان هەبووە.



بەم پێیە تەواوی رووبەروو بوونەوەکانی مێژوو، بەرای ئێمە، ریشەیان لەناکۆکی نێوان هێزەکانی بەرهەمهێنانو شێوەی ئاڵوگۆڕدایە. هاوکات بۆگەیشتن بە بەرەوروو بوونەوە لەیەك وڵاتدا پێویست ناکات کە ئەم ناکۆکییە لەهەمان وڵاتدا بەتایبەتی گەیشتبێتە ئاستی کۆتایی خۆی. ململانێ لەگەڵ وڵاتە پێشکەوتووە پیشەسازییەکانیتردا، کە هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ فراوانبوونی ئاڵوگۆڕی نێونەتەوەیی، بۆ پێکهێنانی ناکۆکییەکی لەو جۆرە لە وڵاتە خاوەن پیشەسازییە کەمتر پێشکەوتووەکاندا بەسە (بۆ نموونە پڕۆلیتاریای نادیار لە ئەڵمانیا لەلایەن ململانێ پیشەسازییەکانی ئینگلستانەوە بەرجەستەییەکی زیاتری پەیدا کرد).

## [ 6_ململانێی کەسەکانو پێکهاتنی چینەکان. ناکۆکی نێوان کەسەکانو هەلومەرجی ژیانی ئەوان. کۆبوونەوەی وەهمیانەی کەسەکان لەکۆمەڵگای بورژوازیو یەکێتی واقعی کەسەکان لەکۆمۆنیزمدا. پەیڕەویکردنی هەلومەرجی کۆمەڵایەتی ژیان لەدەسەڵاتی کەسە یەکگرتووەکان]

ململانێ، کەسەکان، نەتەنها بورژواکان بەڵکوو تەنانەت زیاتر لەوان کرێکاران لەیەکتر جیا دەکاتەوە، بەپێچەوانەی ئەو واقعیەتەی کە ئەوان لەدەوری یەکتر کۆ دەکاتەوە. بەم پێیە ماوەیەکی زۆر دەخایەنێت تا ئەم کەسانە بتوانن یەك بگرن، جیا لەم واقعیەتەی کە بەمەبەستی گەیشتن بەم یەکێتییە –ئەگەر نەیەوێت یەکێتییەکی رووتی ناوچەیی بێت – دەبێت سەرەتا هۆیە پێویستییەکانی ئەو، واتە شارە پیشەسازییە گەورەکانو پەیوەندی گرتنە هەرزانو خێراکان، لەلایەن پیشەسازی گەورە بونیات نرابێت. هەر بۆیە زاڵبوون بەسەر هەر دەسەڵاتێکی رێکخراوبوودا کە کەوتۆتە بەرامبەر ئەم کەسە لەیەك جیایانە، ئەو کەسانەی

لەهەلومەرجێك دا دەژین کە هەر رۆژە ئەم جیایانە بەرهەم دەهێننەوە، تەنیا لەدوای خەباتێکی دوورو درێژ ئیمکانی هەیە. خواستی پێچەوانەی ئەمە ترادیفە لەگەڵ خواستی ئەوەی کە لەم دەورانە دیاریکراوەیەی مێژوودا ململانێ بوونی نەبێت، وەیا ئەوەی کە کەسەکان زەینی خۆیان لەهەلومەرجێك، کە لەحاڵەتی گۆشەگیریدا هیچ جۆرە کۆنترۆڵێکیان بەسەریەوە نییە، رزگار بکەن.

---

دروستکردنی خانوو. بێگومان لەنێوان وەحشیاندا هەر خێزانێك ئەشکەوت یا کوخی خۆی هەیە، وەك چادرە جیاجیاکانی خێزانە کۆچەرەکان. ئەم ئابووریەی خێزانە جیاکان، لەگەڵ گەشەکردنی دواتری خاوەندارێتی تایبەتیدا پێویستریش دەبێت. لەلای خێڵە جووتیارییەکان ئابووری ناوخۆیی ئیشتراکی ئەوەندەی چاندنی ئیشتراکی زەوی ناموومکینە. دروستکردنی شارەکان پێشڕەوییەکی گەورە بوو. لەگەڵ هەموو ئەمانەش دا، لەهەموو دەورانەکانی پێشوودا هەڵوەشاندنەوەی31 ئابووری فەردی، کە لەهەڵوەشاندنەوەی خاوەندارێتی تایبەتی جیاناکرێتەوە، ناموومکین بوو، بەهۆی ئەم هۆیە سادەیەوە کە هەلومەرجی مادی پێویست بۆ ئەو کارە لەئارادا نەبوو. دامەزراندنی ئابوورییەکی ناوخۆیی ئیشتراکی پێویستی بەگەشەی ئامێرەکان، سوود وەرگرتن لەهێزە سروشتییەکان و لەزۆرێك لەهێزە بەرهەمهێنەرەکانی تر –بۆ نموونە سەرچاوەکانی ئاو، رۆشنایی گاز، گەرمی هەڵم و شتی‌تر– و لەناوبردنی جێگا ورێگای شارو لادێییە. بەبێ ئەم هەلومەرجانە، ئابووری ئیشتراکی خۆرسکانە هێزێکی بەرهەمهێنەری نوێ پێك ناهێنێت. [ئەم ئابوورییە] پایەی مادی نەدەبوو، وەتەنیا لەسەر بنەمایەکی فکری رووت رادەوەستێ، بەمانایەکی تر ئارەزوویەکی رووت دەبوو، وەنەدەبووە شتێکی زیاتر لەئابوورییەکی خەڵوەتی. ئەمەی کەچ شتێك ئیمکانی بەجێیەجێ بوونی هەیە، دەتوانرێت لەو شارانەی کە لەرێگای تمرکزەوە هاتبوونە دی و لەدامەزراندنی بینا کۆمەڵییەکان



بۆ مەبەستە جۆرا و جۆرەکان (زیندانەکان، سەربازگاکان و هتد) دا ببینرێت. بەبێ ووتنیش دیارە کەهەڵوەشاندنەوەی ئابووری فەردی لەهەڵوەشاندنەوەی خێزان جیاناکرێتەوە.

---

قسەیەك کە بەزۆری لەلایەن قەدیس سانکۆوە دەردەبڕدرێت، واتە ئەوەی کە هەرکەسێك هەرچییەکە بەهۆی دەوڵەتەوەیە، لەبنەمادا لەجۆری ئەم راگەیاندنەیە کە فەردی بورژوازی تەنیا نموونەیەکە لەجۆری بورژوا. دەربڕینێك کە مەرجی بوونی چینی بورژوای لەپێش فەردە پێکهێنەرەکانیەوە لەخۆ گرتووە [*].

لەسەدەکانی ناوەڕاستدا هاووڵاتیان لەهەر شارێکدا ناچار بوون بۆ بەرگریکردن لەخۆیان لەبەرامبەر خانەدانە خاوەن زەویەکاندا یەکبگرن. گەشەی بازرگانی و دامەزراندنی پەیوەندیەکان، شارە دابڕاوەکانی بەلای پێکهێنانی پەیوەندی لەگەڵ شارەکانی‌تر، کەلەخەباتیاندا لەگەڵ دووژمنی هاوبەشدا بەرژەوەندی وەك یەکیان هەبوو، پێشخۆدا. لەنێوان زۆرێك لە کۆمەڵە ناوچەیەکانی هاووڵاتیاندا لەشارە جۆرا و جۆرەکان، ووردە ووردە چینێکی ناوەڕاست سەری هەڵدا . هەلومەرجی ژیانی هاووڵاتیانی بەتاك کەوتوو–بەهۆی ناکۆکی ئەم هەلومەرجە لەگەڵ پەیوەندییەکان و بەشێوەی کارێك کە لەمەوە سەرچاوەی دەگرت –گۆڕا بەهەلومەرجێك کە بۆ هەموو ئەوانە هاوبەش و سەربەخۆ بوو لەهەر کەسێك. هاووڵاتیان تا ئەو جێیەی کەخۆیان لەرێگریەکانی فیودالی رزگارکردبوو، ئەم هەلومەرجەیان دروست کرد و بەگوێرەی خۆیان تا ئەو شوێنەی کە لەلایەن بەرەو رووبوونەوەکانیانەوە دەبەسترانەوە بەسیستەمی فیودالییەوە، بەهۆی ئەم هەلومەرجەوە دروستبوون. بەپێکهاتنی پەیوەندییە دوو لایەنیەکانی نێوان شارە دابڕاوەکان، ئەم هەلومەرجە هاوبەشە گۆڕا بەهەلومەرجێکی چینایەتی. هەلومەرجی هاوجۆر، ناکۆکی هاوجۆر، بەرژەوەندییە هاوجۆرەکان، ناچارانە

[*] –[نووسینی پەراوێز لەلایەن مارکس:] لای هەیەسووەکان، پێش–بوونی چین.

لەهەموو شوێنێکدا سوونەتێکی ها وجۆریان هێنایە بەرهەم. خودی بورژوازی ووردە ووردە و ها وکات لەگەڵ هەلومەرجی خۆیدا گەشەدەکات، بەگوێرەی دابەشبوونی کار بەسەر بەشە جۆرا و جۆرەکاندا دابەش دەبێت و سەرەنجام هەموو ئەو چینە دەوڵەمەندانەی کە هەبوون بەرەو خۆی رادەکێشا [*] (لەکاتێکدا زۆرینەی نەداری پێشوو، وەبەشێك لەچینە داراکانی تائێستای بەچینێکی نوێ، واتە پڕۆلیتاریا دەگۆڕێت)، تا ئەو شوێنەی کەسەرجەم دارایی دەگۆڕێ بەسەرمایەی پیشەسازی یان بازرگانی.

کەسە لەیەك جیاکان تەنیا تا ئەو شوێنە چینێك پێکدەهێنن کە دەبێت نەبەردێکی ها وبەش لەدژی چینێکیتر بەرەو پێشەوە بەرن. لەکاتەکانی تردا وەك نەیار لەگەڵ یەکتردا لەهەلومەرجێکی دووژمنانەدا دەبن. لەلایەکی ترەوە چین بەگوێرەی خۆی بوونێکی سەربەخۆ لەبەرامبەر کەسەکاندا دەگرێتە خۆی، بەجۆرێك کەئەوانە هەلومەرجی ژیانی خۆیان دیاریکرا و جێگا و رێگای خۆیان لەژیان و بەم پێیە گەشەی شەخسی خۆیان لەلایەن چینەکەیانەوە دەسەپێ بەسەریاندا و بەمشێوەیە دەبنە رایەڵی ئەو چینە. ئەم دیاردەیە هەر وەك دیاردەی پەیڕەویکردنی کەسە جیاوازەکانە لەدابەشبوونی کار و تەنیا بەهەڵوەشاندنەوەی خاوەندارێتی تایبەتی و هەڵوەشاندنەوەی خودی کار دەتوانرێت بخرێتە لاوە. ئێمە تائێستا چەندان جار دەرمان خستووە کەئەم لەخۆگرتنەی کەسەکان لەلایەن چینەوە، پەیڕەوی لەهەموو جۆرەکانی فکرەکان و هتد لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت.

ئەگەر ئەم گەشەیەی فەردەکان، گەشەیەك کە لەهەناوی هەلومەرجی ها وبەشی بوونی توێژەکان و ئەو چینانەی کە مێژوویانە بەدوای یەکتردا دێن پێکدێت و تێگەیشتنە گشتییەکان کە لەم رێگایەوە دەسەپێت بەسەر کەسەکاندا –ئەگەر ئەم گەشەکردنە لەروانگەیەکی فەلسەفیدا تێبینی بکرێت، لەم حاڵەتەدا بێگومان

* –[نووسینی پەراوێز لەلایەن مارکس:] لەسەرەتادا لەهەموو رشتەکانی کار کەراستەوخۆ بەستراوبوونەوە بەدەوڵەتەوە رادەکێشێ و دواتر کەمتا زۆر هەموو کارەکانی ئایدیۆلۆژیك.



وێناکردنی ئەوەی کە لەمدا کەسەکان، جۆر، یا ئینسان گەشەی کردوەو یائەوانە ئینسانیان گەشە پێداوە، زۆر سادە دەبوو، وە لەم رێگایەوە دەتوانرێت تانەیەکی سەخت لەمێژوو بدرێت. ئینسان دواتر دەتوانێت ئەم تاقم و چینانە بەچەمکێکی تایبەت لەبەیانی گشتی، جۆرەکانی شوێن کەوتووی جۆر یا قۆناغەکانی کامڵبوونی ئینسان بێنێتە بەرچاو.

ئەم لەخۆگرتنەی کەسەکان لەلایەن چینە دیاریکراوەکانەوە، تائەو کاتەی چینێك گەشە بکات کە هیچ بەرژەوەنییەکی چینایەتی تایبەتی بۆ دەرکەوتن لەبەرامبەر چینی دەسەڵاتداردا نەبێت، ناتوانێت هەڵبوەشێتەوە.

---

گۆڕینی دەسەڵاتە (پەیوەندییەکان) شەخسییەکان بەدەسەڵاتە مادییەکان کە بەهۆی دابەشبوونی کارەوە ها توونەتەدی ناتوانێت بەدەرکردنی ئەو فکرە گشتیانە لەمێشکی ئینساندا بکرێت، بەڵکو لەناوبردنی ئەوە تەنیا لەلایەن ئەو کەسانەی کەدووبارە ئەم دەسەڵاتە مادیەیان کردۆتە ملکەچی خۆیان و دابەشبوونی کار هەڵدەوەشێننەوە، مومکینە [*]. ئەمە بەبێ کۆمەڵبوون ناکرێت. تەنیا لەنا وخۆی کۆمەڵبووندایە کە هەر کەسە هۆکاری پێگەیاندنی ئامادەییەکانی خۆی لە هەموو لایەکەوە هەیە. کەواتە ئازادی تاکە کەس تەنیا لەنا وخۆی کۆمەڵدا مومکین دەبێت. لەجێگرەوەکانی تائێستای کۆمەڵ، واتە لەدەوڵەت و هتددا، ئازادی تاکە کەس تەنیا بۆ کەسانێك کەلەژێر هەلومەرجی چینی فەرمانڕەوادا پێدەگەن، وەتەنیا تا ئەو شوێنەی کە ئەوانە کەسانی ئەم چینە بوون، بوونی هەبووە. کۆبوونەوەیەکی وەهمی کە تائێستا کەسەکانی تیادا رێکخراون، هەمیشە لەپەیوەند بەوانەوە بوونێکی سەربەخۆ دەگرێتە خۆی و لەبەر ئەوەی پێکهاتەیەك بووە لەچینێك دژی چینێکیتر، هەر بۆیە بۆ چینە چەوساوەکە نەتەنیا کۆبونەوەیەکی تەواو وەهمی بەڵکوو لەهەمان کاتدا قەیدو

* –[نووسینی پەراوێز لەلایەن ئەنگلس:] (فیورباخ: بوون و زات).

بەندێکیش پێکدەهێنێت. لەکۆبوونەوەی واقعیدا، کەسەکان ئازادی خۆیان لەبەیەکەوە پەیوەستی و لەرێگای بەیەکەوە پەیوەستیانەوە دەستدەکەوێت.

کەسەکان هەمیشە لەخۆیانەوە حەرەکەتیان کردووە، بەڵام بێگومان لەدڵی هەلومەرج و پەیوەندییە دیاریکراوە مێژوویەکانیاندا، نەك لەفەردی "ووت" بەو مانایەی کە ئایدیۆلۆژیستەکان بۆی دەچن. بەڵام لەرەوتی گەشەی مێژوویی و رێك بەهۆی ئەم واقعیەتەی کە لەنا و دابەشبوونی کاردا پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان وەك پێویست بوونێکی سەربەخۆ بەدەست دەهێنن، بەم پێیە لەژیانی هەر کەسێکدا، تا ئەو شوێنەی کە ئەم ژیانە شەخسی بووەو لەلایەن لایەنێك لەکارو هەلومەرجی پەیوەست بەوەوە دیاریدەکرێت، قڵشتێك پەیدا دەبێت. (مەبەستی ئێمە ئەمە نییە کەلێرەدا بەو جۆرە وەربگیرێت کە بۆ نموونە خاوەندار، سەرمایەدارو هتد شەخس نین، بەڵکو مەبەست ئەمەیە کە شەخسیەتی ئەوانە لەلایەن پەیوەنییە چینایەتییە تەواو دیارەکانەوە دیاریدەکرێت و ئەم قڵشتە تەنیا لەجێگای نەیارییان لەگەڵ چینێکی تردا و بۆ خۆشیان تەنیا کاتێك تێك دەشکێن، دەردەکەون). لەتوێژەکاندا (وتەنانەت لەوە زیاتر لەتایەفە) ئەمە هێشتا داپۆشراوە: بۆ نموونە خانەدانێك هەمیشە بەخانەدانەیی دەمێنێتەوە و کەسێکی ئاسایی هەمیشە بەکەسێکی ئاسایی، [گوایە ئەم] چۆنایەتییە لەفەردییەتەکەی جیا نابێتەوەو بەدەرە لەسەرجەم پەیوەندییەکانی ئەو. جیاوازی نێوان فەردی تایبەتی و فەردی چینایەتی، تایبە تمەندی هەڵکەوتەیی هەلومەرجی ژیان بۆ فەرد، تەنیا لەگەڵ دەرکەوتنی چین، کە خۆی بەرهەمی بورژوازییە دەردەکەوێت. ئەم تایبە تمەندییە هەڵکەوتییە خۆی تەنیا لەرێگای ململانێ و خەباتی نێوان کەسەکانەوە پەیدا دەبێت و گەشە دەکات. بەمشێوەیە لەدنیای خەیاڵدا کەسەکان لەژێر دەسەڵاتی بورژوازیدا لەهەموو کات ئازادتر دێنە بەرچا و. بەڵام لەراستیدا ئەوانە کەمتر ئازادن چونکە بەئاستێکی زیاتر لەژێر فەرمانڕەوایی هێزە مادییەکاندان. جیاوازی لەگەڵ توێژیکی تایبەتدا لەبەرەو رووبوونەوەی نێوان



پرۆلیتاریا و بورژوازیدا دەردەکەوێت. کاتێك کەتوێژە شارنشینەکان، پیشەکان و هتد لەناکۆکی لەگەڵ خانەدانی زەویدارەکاندا سەریدەرهێنا، هەلومەرجی بوونی ئەوانە- واتە دارایی گوێزراوەو کاری پیشەیی، کە خۆی پێش جیابوونەوەی ئەوانە لەئۆرگانە فیودالییەکان بەشێوەیەکی شاراوە هەبوون- بوونێکی جێگیری وەرگرت کەلەبەرامبەر خاوەندارێتی زەوی فیودالیدا خرایە سەر تەخت و بەم پێیە لەسەرەتادا بەشێوەی تایبەتی خۆی شکڵێکی فیودالی بەخۆوە گرت. بێگومان رەعیەتە هەڵاتووەکان کۆیلەیەتی پێشووی خۆیان هەر وەك مەسەلەیەکی دەرەکی سەبارەت بە شەخسیەتی خۆی بەحساب دەهێنا. بەڵام ئەوانە لەم بارەیەوە تەنیا ئەو کارەیان دەکرد کە هەر چینێك کە لەحاڵەتی رزگارکردنی خۆی لەکۆتو پێوەندا بێت ئەنجامی ئەدات. بەم جۆرە ئەوانە خۆیان نەك وەك چین بەڵکوو فەردیانە ئازاد دەکرد. سەرباری ئەمە، ئەوانە لەسیستەمی رشتەیی دانەبڕان بەڵکوو رشتەیەکی نوێیان پێکهێنا، تەنانەت شێوەی کاری پێشووی خۆیان لەهەلومەرجە نوێ کەیشیاندا پاراست و بەدەرکێشانی ئەو شێوە کارە لەکۆتو پێوەندەکانی پێشوو، کە ئیتر لەگەڵ ئەو پێشڕەویەی هاتبووە دەست نەدەهاتەوە، ئەوەیان زیاتر گەشەپێدا.

لەلایەکی ترەوە بۆ پڕۆلیتەرەکان مەرجی ژیان، واتە کارو هاوکات لەگەڵ ئەودا تەواوی هەلومەرجی کۆمەڵگای ئێستایان گۆڕاوە بەشتێکی دەرەکی، شتێك کەئەوانە وەك فەردە جیاجیاکان کۆنترۆڵیان بەسەریەوە نەبوو، وەهیچ رێکخراوێکی کۆمەڵایەتی ناتوانێت کۆنترۆڵکردنی ئەوانیان پێبدات. ناکۆکی نێوان فەردیەتی هەر فەردێکی پڕۆلیتەرو کار، ئەم هەلومەرجە سەپاوەی ژیانە بەسەر ئەودا، لەم روەوە بۆئەو روون دەبێتەوە کە ئەو لەلاوێتیدا کراوەتە قوربانی و لەنا و چینی خۆیدا هیچ شانسێکی بۆ گەیشتن بەهەلومەرجێك کە ئەو بخاتە چینێکی ترەوە نییە.

سەرنج. نابێت فەرامۆش بکرێت کە خودی پێویستی رەعیەت بەمانەوەو نەبوونی ئیمکانی ئابوورییەك لەئاستێکی گەورەدا، خۆی خزاندە ناو دابەش کردنی بەشی زەوی لەنێوان رەعیەتەکان و زۆر زوو خزمەتی رەعیەتی بۆ خاوەنەکەی دابەزاندە ئاستێکی کەمتر لەدەستکەوتەکانی کەل و پەل و ئەرکی بێگاری. ئەمە ئەوەی بۆ رەعیەت مەیسەر کرد کە دارایی گوێزراوە کەڵەکە بکات و بەم شێوەیە هەڵاتنی ئەوی لەلای خاوەنەکەی ئاسان دەکردو ئاسۆی دۆزینەوەی رێگای خۆی وەك کەسێکی شاری پێئەدا. هەروەها لەنێوان رەعیەتەکاندا دابەشبوونێکی پێکهێنا، بەجۆرێك کە رەعیەتە هەڵاتووەکان خۆیان نیوە شارنشینیش بوون. بەهەمان شێوە ئاساییە کە ئەو رەعیەتانەی لەپیشەیەك دا خاوەن شارەزایی بوون، باشترین شانسیان بۆدەستکەوتنی دارایی گوێزراوە هەبوو.

بەمشێوەیە رەعیەتە هەڵاتووەکان تەنیا حەزیان دەکرد کە ماوەی فرسەتی کاری تەواویان بۆ گەشەو دارشتنی هەلومەرجی ژیانیان هەبێت، بەم پێیە لەدواجاردا تەنیا دەگەیشتنە کاری ئازاد. لەکاتێکدا کە پرۆلیتەرەکان ئەگەر بیانەوێت کەوەك فەردەکان بوونیان دەرخەن، ناچارن هەلومەرجی تائێستای زاڵی بوونیان (کە هاوکات تائەوکاتە هەلومەرجی بوونی سەرجەم کۆمەڵگاش بووە). واتە کار هەڵبوەشێننەوە. بەم جۆرە ئەوانە خۆیان راستەوخۆ لەگەڵ ئەو شکڵە لەبەرامبەرکێدا دەبینیەوە کەفەردەکان، ئەو فەردانەی کە کۆمەڵگا پێکدەهێنن، تائێستا بەهۆی ئەوەوە بەیانێکی دەستە جەمعیان بەخشیبووە خۆیان، واتە لەگەڵ دەوڵەت. هەر بۆیە بۆ سەلماندنی بوونی خۆیان وەك فەردەکان دەبێت دەوڵەت لەنا و بەرن.

---



لەسەرجەم ئەوەی تائێستا وو تمان ئەم ئەنجامە دێتە دەست کە[*] [تا ئێستا] پەیوەندییەکانی کۆمەڵەیەك کەفەردەکانی چینێك دەچوونە ناویەوە، ئەو پەیوەندییانەی کە لەلایەن بەرژەوەندییە هاوبەشەکانیانەوە لەدژی لایەنی سێیەم دەردەکەوێت، هەمیشە کۆبوونەوەیەك بووە کە ئەم فەردانە تەنیا وەك فەردە نێوەندگیرەکان و تەنیا تائەو شوێنەی لەچوارچێوەی هەلومەرجی بوونی چینەکەیاندا دەژیان پەیوەندییان پێوە هەبوو –پەیوەندییەك کە ئەوان نەك وەك فەردەکان، بەڵکوو وەك ئەندامانی چینێك بەشداریان تێدا دەکرد. لەکاتێکدا کە لەکۆمەڵە پرۆلیتەرییە شۆرشگێرییەکاندا، کە هەلومەرجی بوونی خۆیان و باقی ئەندامانی کۆمەڵگا دەخەنە دەستی خۆیانەوە، رێك پێچەوانەی ئەمە راستە: فەردەکان وەك فەردەکان لەم کۆمەڵانەدا بەشداری دەکەن. کە ئەمە بەیەکەوە پەیوەست بوونی فەردەکانە (بێگومان بەفەرزی قۆناغێکی پێشکەوتووی هێزەکانی بەرهەمهێنانی هاوچەرخ) کە هەلومەرجی گەشەو حەرەکەتی ئازادانەی فەردەکان دەخاتە ژێر دەستیانەوە. ئەم هەلومەرجە پێشووتر سپێردرایە رێکەوت و بوونێکی لەبەرامبەرو سەربەخۆ لەفەردە جیاجیاکا بەخۆوە دەگرت، رێك: بەم هۆیەی کە ئەوانە وەك فەردەکان لەیەکتر جیابوون و بەم هۆیەیشەوە کە هاوپەیوەستی ناچارانەی ئەوان، لەلایەن دابەشبوونی کارەوە دیاریکراوە، لەئەنجامی ئەم جیاییەدا بۆیان دەبووە پەیوەندییەکی نامۆ. تا ئێستا هاوپەیوەستی (نەك هاوپەیوەستییەکی ئارەزووانە، بەو جۆرەی کە بۆنموونە لەپەیمانی کۆمەڵایەتیدا32 شیکراوەتەوە، بەڵکوو هاوپەیوەستییەکی پێویست) تەنیا رێکەوتنێك بوو لەسەر ئەم هەلومەرجە کە لەناوخۆی ئەودا فەردەکان ئازاد بوون بەختی خۆیان تاقی بکەنەوە (بۆ نموونە پێکهاتنی حکومەتی ئەمریکای باکورو کۆمارەکانی ئەمریکای باشوور بەراورد بکە). ئەم مافی بەهرەمەندبوونە کە

---

[*] [ئەم بەشەی خوارەوە لەدەستنووسەکەدا خەتی بەسەردا هاتووە:] لەهەر دەورانێکی مێژوویيدا، کەسانێك کەخۆیان ئازاد کردووە، تەنیا هەلومەرجی بوونی ئەوکاتی دەوروبەری خۆیان زیاتر گەشە پێداوە.

لەلایەن ڕێکەت و شانسەوە دەستی لێنەدراوە لەژێر هەلومەرجێکی دیاریکراودا تائێستا پێی ووتراوە ئازادییە شەخسییەکان. ئەم هەلومەرجی بوونە، بێگومان تەنیا بەرهەمی هێزە بەرهەمهێنەرەکان و شێوەکانی ئاڵوگۆڕە لەهەر سەردەمێکی تایبەتدا.

---

جیاوازی کۆمۆنیزم لەگەڵ سەرجەم بزووتنەوەکانی پێشوودا لەمەدایە کە کۆمۆنیزم بنەمای هەموو پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕی پێشوو هەڵدەوەشێنێتەوەو بۆ یەکەمین جار هووشیارانە ئەو فەرزیاتانەی کە بەشێوەیەکی سروشتی گەشەیان کردووە، وەك دروستکراوی ئەو ئینسانانەی تائێستا هەن دەداتە بەرباس، تایبەتمەندی سروشتی ئەوانە وەردەگریٚ و دەیانخاتە ژێر دەسەڵاتی فەردە یەکگرتووەکانەوە. بەم پێیە ڕێکخراوەکەی، واتە بەرهەمهێنانی مادی هەلومەرجی ئەم یەکگرتنە، لەبنەڕەتەوە ئابوورییە. کۆمۆنیزم ئەم هەلومەرجە دەگۆڕێت بەهەلومەرجی یەکگرتوو تا ئەو شوێنەی کە واقعیەت بەهەر حاڵ تەنیا بەرهەمی ئاڵوگۆڕی پێشووی فەردەکانە، ڕێك بنەما حەقیقییەکەی ئەمەیە کە بوونی هەر شتێکی سەربەخۆ لەفەردە ئینسانیەکان نامومکین بکات. بەم شێوەیە کۆمۆنیستەکان بەکردەوە لەبەرامبەر هەلومەرجێکدا کە تائێستا لەلایەن بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕەوە پێك هاتووە، وەك هەلومەرجێکی نائۆرگانیکی هەڵوێست وەردەگرن، بەڵام بەبیٚ ئەوەی کە وا بۆی بچن ئەمە نەخشە یا دیاریکراوی نەوەکانی پێشوو بووە کە بەرژەوەندییەکانی ئەو فەراهەم بکەن و بەبیٚ بڕوابوون بەمەی کە ئەم هەلومەرجە بۆ کەسانێك کە ئەوانەیان دروست دەکرد نائۆرگانیك بووە.



## [7-ناکۆکی نێوان کەسەکان و هەلومەرجی ژیانی ئەوان وەك ناکۆکی نێوان هێزە بەرهەمهێنەرەکان و شێوەکانی ئاڵوگۆڕ. گەشەی هێزە بەرهەمهێنەرەکان و شێوەکانی گۆڕانی ئاڵوگۆڕ]

جیاوازی نێوان کەسەکان وەك شەخسێك لەگەڵ ئەو شتانەی بەنسبەت ئەوەوە دەرەکییە، جیاوازییەك نییە لەتێگەیشتنەکاندا، بەڵکوو واقعیەتێکی مێژووییە. ئەم جیاوازییە لەکاتە جیاوازەکاندا گرنگییەکی جیاوازی هەیە -بۆ نموونە توێژ وەك شتێکی دەرەکی سەبارەت بەفەرد لەسەدەی هەژدەیەم و بەهەمان شێوەش کەم تازۆر خێزان. ئەمە جیاوازییەك نییە کە دەبێت ئێمە بۆ هەر سەردەمێك بەکاری بهێنین، بەڵکوو جیاوازییەکە کەهەر سەردەمێك خۆی لەنێوان ئەو پێکهێنەرە جیاوازانەی کە پەیدا دەبن و لەڕاستیدا نەك بەگوێرەی هیچ فکرەیەك، بەڵکوو بەزەختی بەیەکدادانە مادییەکانی ژیان، بەکاری دەهێنێت.

ئەوەی بۆ سەردەمی دواتر لەبەرامبەر سەردەمی پێشوودا ڕێکەوتانە دێتە بەرچاو -وە ئەمە لەبارەی ئەو پێکهێنەرانەی کە لەسەردەمی پێشووەوە بەمیراتیش مابونەوە ڕاستە- شێوەیەکە لەئاڵوگۆڕ لەگەڵ قۆناغێکی دیاریکراو لەگەشەی هێزەکانی بەرهەمهێناندا دێتەوە. پەیوەندی هێزەکانی بەرهەمهێنان لەگەڵ شێوەی ئاڵوگۆڕدا، پەیوەندی شێوەی ئاڵوگۆڕە لەگەڵ کار یان چالاکی فەردەکاندا. (بێگومان شێوەی بنەڕەتی ئەم چالاکییە مادیانەیەو باقی شێوەکان -زەینی، سیاسی،دینی و هتد- پشتیان بەو بەستووە. بێگومان شێوە جۆراو جۆرەکانی ژیانی مادی لەهەر بارێکەوە پشتیان بەو پێویستیانە کە تائەو کات گەشەیان کردووەو بە بەرهەمهێنان و دابینکردنی ئەم پێویستیانە لەپڕۆسەیەکی مێژووییدا، بەستووە، کە ئەمە لەبارەی مەڕ یان سەگ (بەڵگە سەرسەختییە ئەسڵییەکانی شترنر لەدژی ئینسان) نابینرێت، گەرچی مەڕەکان یان سەگەکان لەشێوەی ئێستایاندا، ئەڵبەتە بەبیٚ خواستی خۆیان، بەرهەمی پڕۆسەیەکی

مێژووین. هەلومەرجێك كە لەودا فەردەكان ئاڵوگۆڕ لەگەڵ یەكتریدا دەكەن، لەبەر ئەوەی كە ئەم ناكۆكییە نییە، هەلومەرجێكی وابەستەیە بەفەردیەتی ئەوانەوە كە بەهیچ جۆرێك بەدەر نییە لەوان. بەم شێوەیە هەلومەرجێك كە ئەم فەردە دیاریكراوانە، كە لەژێر پەیوەندییە دیاریكراوەكاندا دەژین، دەتوانن لەژێر ئەودا ژیانی مادی خۆیان و هەرچییەك مەڕبووتە بەوەوە بەرهەم بهێنن، هەلومەرجی خۆ_چالاكی ئەوان پێكدەهێنێت و لەلایەن ئەم خۆ_چالاكییەوە بەرهەم دێت*. بەم پێیە هەلومەرجێكی دیاریكراو كە ئەوان لەژێریدا بەرهەم دەهێنن، لەبەر ئەوەی كە ناكۆكی هێشتا دەرنەكەوتووە، لەگەڵ واقعیەتی تایبەتی مەرجداری ئەواندا، لەگەڵ بوونی یەك لایەنەی ئەواندا دێتەوە و یەك لایەنە ئەوە تەنیا كاتێك دەردەكەوێت كە ناكۆكی دێتە مەیدانەوەو بەم پێیە بەقەتیس كراوی بۆ كەسانێك بوونی هەیە كە دواتر دەژین. لەدواجاردا ئەم هەلومەرجە وەك كۆتو پێوەندێكی رێكەوت دەردەكەوێت و هووشیاری بەوەی كە كۆتو پێوەندە، دەدرێتە پاڵ سەردەمی پێش ئەویشەوە.

ئەم هەلومەرجە جۆرا و جۆرانە كە لەسەرەتادا وەك هەلومەرجی خۆ_چالاكی و دواتر وەك كۆتو پێوەندێك بەسەر ئەواندا دەردەكەوێت، لەسەرجەم ڕەوەندی گۆڕانی مێژوو، زنجیرەیەكی بەیەكەوە بەسترا و لەشكڵەكانی ئاڵوگۆڕ پێكدەهێنێت كە بەیەكەوە پەیوەستییەكەی لەمەدایە: شێوەیەكی پێشووی ئاڵوگۆڕ، كە بووەتە كۆتو پێوەند، جێگای خۆی دەدات بەشێوەیەكی نوێ كە لەگەڵ هێزەكانی بەرهەمهێنانی گەشە كردووتردا و بەم پێیە لەگەڵ شێوەكانی پێشكەوتووی خۆ_چالاكی فەردەكاندا دێتەوە. ئەم شێوەیەش بەگوێرەی خۆی دەگۆڕێت بەكۆتو پێوەندو دواتر شێوەیەكی تر جێگاكەی دەگرێتەوە. لەو شوێنەوە كە ئەم هەلومەرجە لەهەر قۆناغێكدا لەگەڵ گەشەكردنی هاوكاتی هێزەكانی بەرهەمهێناندا دێتەوە، كەواتە مێژووی ئەوان لەهەمان كاتدا مێژووی پێشكەوتنی

---

* –[نووسینی پەراوێز لەلایەن ماركس:] بەرهەمهێنانی خودی شێوەی ئاڵوگۆڕ.



هێزەكانی بەرهەمهێنانە كە لەلایەن هەر نەوەیەكی نوێوە وەردەگیرێ و بەم پێیە مێژوو گەشەی هێزەكانی خودی فەردەكانە.

لەو شوێنەوە كە ئەم گەشەكردنە خۆرسكانە پێك دێت، واتە مل كەچی نەخشەی ئەو كەسانە نییە كەئارەزوومەندانە یەكیان گرتووە، بەم پێیە لەشوێنە جۆراوجۆرەكاندا، خێڵەكان، نەتەوەكان، بەشەكانی كارو هتد... دەست دەكەن بەپێشڕەوی، هەر یەكێك لەوانە لەسەرەتادا سەربەخۆ لەوانیتر گەشە دەكات و تەنیا لەسەرخۆ پەیوەندی لەگەڵ ئەوانی تردا پێكدەهێنێت. جیا لەمە، ئەم گەشەكردنە زۆر سستانە ئەنجام ئەدرێت. قۆناغەكان و بەرژەوەندییە جۆراو جۆرەكان هیچ كاتێك بەتەواوی لەناو ناچن، بەڵكوو دەكەونە ژێر چاودێری بەرژەوەندی زاڵەوەو چەندان سەدە خۆی بەدوای ئەواندا پڕكێش دەكات. لەم شوێنەدا ئەو ئەنجامە دێتە دەست كە تەنانەت لەنا و خۆی نەتەوەیەكدا، فەردەكان تەنانەت بەچاوپۆشین لەهەلومەرجی داراییان گەشەی تەواو جیاوازیان هەیە و ئەو ئەنجامەش وەردەگیرێت كەبەرژەوەندی پێشووتر كەشێوەی ئاڵوگۆڕە تایبەتییەكەی لەلایەن شێوەی تایبەت بەبەرژەوەندی دواتر، لەدەورەكە دەچێتە دەرەوە، ماوەیەكی زۆر دەمێنێتەوەو دەسەڵاتێكی سەڵتەنەتی لەكۆمەڵە وەهمیەكاندا (دەوڵەت، یاسا)، كۆمەڵەیەك كەبوونێكی سەربەخۆی لەفەردەكان لەخۆ گرتووە، لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا دەیهێڵێتەوە. دەسەڵاتێك كە لەدواجاردا تەنیا بەهۆی شۆڕشێكەوە دەتوانرێت لەبەر یەك هەڵبوەشێنرێتەوە. ئەم [مەسەلەیە] دەتوانرێت لەپەیوەند بەخاڵە تایبەتەكان كە مۆڵەتی گەلاڵەیەكی گشتیتر دەدەن، ئەم [دیاردەیە] ڕوونبكاتەوە كە بۆچی هەندێ جار دەكرێت هووشیاری لەهەلومەرجی تەجریبی سەردەمی خۆشیان پێشكەوتووتر بێنە بەرچاو، بەجۆرێك كە لەخەباتەكانی دەورانەكانی دواتردا شەخسێك دەتوانێت وەك سەرچاوە معتەبەرەكان بگەڕێتەوە سەر تیۆریسینەكانی دەورەی پێشوو.

لەلایەکی ترەوە لەووڵاتەکانی وەك ئەمریکای باکوور، کە لەدەورانێکی لەحاڵەتی پێشکەوتووی مێژوویی لەسفرەوە دەست پێدەکەن، گەشەکردنێکی زۆر خێرا بەرەو پێشەوە دەچێت. ئەم وڵاتانە فەرزیاتێکی سروشتییان بێجگە لەو کەسانەی کە لەوێدا جێگیربوون نییە، ئەو فەردانە لەبەر ئەمە راپێچی ئەم نشتەجێیوونە کراون کە شێوەکانی ئاڵوگۆڕی وڵاتە کۆنەکان لەگەڵ پێویستیەکانی ئەواندا نەدەهاتەوە. بەمشێوەیە ئەم وڵاتانە لەگەڵ پێشکەوتووترین فەردەکانی ووڵاتە کۆنەکان و بەم پێیە لەگەڵ پێشکەوتووترین شێوەکانی ئاڵوگۆڕی هاوشان لەگەڵ ئەودا دەست پێدەکەن، تەنانەت پێش ئەوەی کە ئەم شێوە ئاڵوگۆڕانە توانیبێتیان لەووڵاتە کۆنەکاندا جێگیر بووبێت. مەسەلەکە لەسەرجەم کۆچ نشینەکاندا، لەبەر ئەوەی کە تەنیا پایەگانی سەربازی یا بازرگانی نین، لەم جۆرەی ئەمەیە. خێمە چییەکان، کلینەکانی یۆنانی و ڤایسلەند لەسەدەکانی یانزەیەم و دوانزەیەم دا زۆر نموونە لەم [مەسەلەیە] دەردەبڕن. کاتێك کەشێوەیەکی ئاڵوگۆڕ کە لەسەر زەوییەکی تردا گەشەی کردووە لەرێگای تووندو تیژییەوە بەجۆرێکی تەواو هێنراوەتە ووڵاتانی داگیر کراوەوە، پەیوەندییەکی هاوچەشن لەم سەرکەوتنەوە سەر هەڵئەدات: واتە لەحاڵێکدا کە ئەم شێوە ئاڵوگۆڕە لەووڵاتی خۆیدا هێشتا لەگەڵ رێگری و بەرژەوەندیەکان و پەیوەندییە جێماوەکانی دەورانی پێشوودا روو بەرووە، لێرەدا بەهۆی دابینکردنی دەسەڵاتی پایەداری داگیرکەرەکانیشەوە بووە، دەتوانرێت و دەبێت بەشێوەیەکی تەواو بەبێ رێگری جێگیر بکرێت. (ئینگلستان و ناپل کەلەدوای زاڵبوونی نورمانەکان بوونە خاوەنی پێگەیووترین جۆری رێکخراوی فیودالی).

---



## [8-دەوری تووندو تیژی (زاڵبوون) لەمێژوودا]

وادێتە بەرچاو کەدیاردەی توندوتیژی سەرجەمی ئەم تێگەیشتنە لەمێژوو رەتدەکاتەوە. ئێستا تووندو تیژی، جەنگ، تالان، کوشتن و رێگری و هتد وەك هێزی جولێنەری مێژوو قبولکراوە. ئێمە لێرەدا دەبێت خۆمان بەخاڵە سەرەکیەکانەوە قەتیس بکەینەوەو لەگەڵ ئەوەدا تەنیا بەرجەستەترین نمونە لەبەرچا و بگرین _تیاچوونی شارستانێتییەکی کۆن بەهۆی خەڵکانی وەحشی و پێکهاتنی دواتری رێکخراوێکی تەواو نوێی کۆمەڵگا. (رۆم و بەربەریەکان، فیودالیزم و [خێڵ] ئیمپراتۆری بێزەنتین و تورکەکان).

لای بەربەرییە داگیرکەرەکان، هەر بەوجۆرەی کەلەسەرەوە ئیشارەتی بۆکرا[س]، خودی جەنگ هێشتا شێوەیەکی رێکخراوی ئاڵوگۆڕەو لەکاتێکدا کە زیاد بوونی دانیشتوان هاوکات لەگەڵ شێوەی بەرهەمهێنانی دێرینەو بەم پێیە تەنیا شێوەی خاوی مومکین، پێویستی بەهۆیە نوێکانی بەرهەمهێنان زۆرتر دەکات، بەهاندانێکی هەرچی زیاترەوە دەیخاتە خزمەت خۆیەوە. لەلایەکی ترەوە لەئیتالیا چەقبەستنی خاوەندارێتی زەوی (کە نەتەنیا لەفرۆشتنە گشتییەکانی زەوییە قەرزارییەکان بەڵکوو لەمیراتیشەوە سەرچاوەی گرتبوو، چونکە لەگەڵ رەواجی ژیانی بێ بەندو بارو کەمی ژن هێنان، خێزانە کۆنەکان وورده وورده لەناوچوون و ئەوەی هەیان بوو کەوتە دەستی ژمارەیەکی کەمەوە، وەگۆڕینی ئەوە بۆ لەوەڕگا کە نەتەنیا بەهۆی کارە ئابوورییە کارپێکراوەکان کە ئەمڕۆش هەن، بەڵکوو بەهۆی هێنانی دانەوێڵەی دەست بەسەراگیراو و وەرگیراو و لەجێی باج و لەئەنجامدا پێویست نەبوون بە دانەوێڵەی ئیتالیا هاتبووە دی)، بووە هۆی لەناوچوونی نزیکەی تەواوی دانیشتوانی ئازاد. کۆیلەکان زۆر جار لەناو دەچوون و دەبوایە بەبەردەوامی بەکۆیلە نوێکان جێگایان پڕ بکرێتەوە.

---

[س] –پێدەچێت ئیشارەتێك بێت بۆ یەکێك لەلاپەڕە وونبووەکانی دەستنووسەکە. فکرەی لەم جۆرە لەنوسخە پاکنووس کراوەکەدا بەیانکراوە. (پ)

کۆیلەیەتی [وەك] بنەمای هەموو پرۆسەی بەرهەمهێنان مایەوە. پلبینەکان، کە شتێك بوون لەنێوان پیاوانی ئازادو کۆیلەکان، هیچ کاتێك نەیتوانی ببێتە شتێکی زیاتر لەجەماوەرێکی پڕۆلیتەر. رۆم لەراستیدا هەرگیز نەبووە شتێکی زیاتر لەشارێك. پەیوەندیەکانی ئەو لەگەڵ وویلایەتەکاندا تەقریبەن بەتەواوی سیاسی بوو، وەبەم پێیە دەیتوانی بەئاسانیش لەلایەن رووداوە سیاسییەکانەوە لەبەریەك هەڵبووەشێتەوە.

---

هیچ شێك لەم بۆچوونە باوتر نییە کە لەمێژووی تائێستادا مەسەلە لەسەر گرتن بووە. بەربەریەکان ئیمپراتۆری رۆم دەگرن و ئەم فاکتۆری گرتنە بووەتە ئامرازێك بۆ روونکردنەوەی تێپەڕبوون لەدنیای کۆنەوە بۆ سیستەمی فیودالی. ئێستا ئەوەی کە لەم گرتنەدا لەلایەن بەربەریەکانەوە مەسەلەیە ئەمەیە ئایا وولاتێك کە داگیردەکرێت هێزەکانی بەرهەمهێنانی پیشەسازی، بەو جۆرەی کە لەلایەن نەتەوە هاوچەرخەکانەوە راستە، گەشە پێداوە یا ئەوەی کەبەشێکی گەورەی هێزە بەرهەمهێنانەکەی بەقەتیس کراوی لەسەر پایەی چەقبەستن و کۆمەڵبوون وەستاوە. جیا لەمە، گرتن لەگەڵ ئەو شتەی کە دەگیرێت مەرجدار دەبێتەوە. سامانی خاوەن بانقێك کە لەوەرەقە کاغەزیەکان پێکدێت، بەهیچ جۆرێك ناتوانێت بەبێ ملدانی داگیرکەر بۆ هەلومەرجەکانی بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕی وولاتە داگیرکراوەکە بگیرێت. سەرجەم سەرمایەی پیشەسازی وڵاتێکی پیشکەوتووش بەم جۆرەیە. وەلەدواجاردا ئەوەی کە گرتنی هەموو شوێنێك بەزوویی کۆتایی هەیەو کاتێك کە ئیتر شتێك بۆگرتن نەمابێتەوە، ناچار دەبێت دەست بەبەرهەمهێنان بکرێت. لەم پێویستیەی بەرهەمهێنانە، کەزۆر زوو خۆی دەسەپێنێت، ئەنجامێکی وەها وەردەگرێت کە ئەو جۆرە لەکۆمەڵبوونە داگیرکەرە نیشەجێ بووەکان بەدەستییەوە دەگرن، دەبێت لەگەڵ قۆناغی گەشەی هێزەکانی بەرهەمهێنان کەئەوانە دەستیان دەکەوێت، بگونجێت. وەیا ئەگەر لەسەرەتای کارەوە بەم جۆرە نەبێت، دەبێت گونجاوانە لەگەڵ هێزەکانی بەرهەمهێناندا بگۆڕدرێت. ئەم [خاڵە] ئەم راستیەش کە هەمووان وا رایدەگەیەنن لەهەموو شوێنێکدا ئەوەیان لەدەورانی دوای کۆچکردنی خێڵەکانەوە تێبینی کردووە، واتە ئەوەی خزمەتکار بووەتە خاوەن و داگیرکەران بەخێرایی زمان و فەرهەنگ و شێوەکانی داگیرکراوەکانیان بەدەستەوە گرتووە، روونەکاتەوە.

سیستەمی فیودالی بەهیچ جۆرێك حازرو ئامادە لەئەڵمانیاوە نەهێنراوە، بەڵکوو سەرچاوەکەی تائەو شوێنەی کە بەداگیرکەرانەوە مەربووت دەبێتەوە، لەرێکخراوی سەربازی سوپادا لەنا و رەوەندی خودی داگیرکردندا بووە، وەئەمەش تەنیا لەدوای داگیرکردن لەرێگای کاریگەری هێزەکانی بەرهەمهێنانێك کە لەوڵاتی داگیرکراودا دەستدەکەوێت، تائاستی سیستەمی فیودالی بەمانای تایبەتی ووشەکە پەرەی سەند. ئەمەی کە ئەم شکڵە [کۆمەڵبوونە] تاچ ئاستێك لەلایەن هێزەکانی بەرهەمهێنانەوە دیاریدەکرا، دەتوانرێت لەو هەوڵە بێ ئەنجامانەوە ببینرێت کەبۆ بەدیهێنانی ئەو شێوانەیتر کە لەپاشماوەکانی رۆحی کۆنەوە سەرچاوەی گرتبوو کاری پێئەکرا. (شارمانی و هتد).

دریژەی هەیە.

## 9-ناکۆکی نێوان هێزەکانی بەرهەمهێنان وشێوەی ئاڵوگۆڕ لەهەلومەرجی پیشەسازی گەورەو ململانێی ئازاددا. ناکۆکی نێوان کاروسەرمایە]

لەپیشەسازی گەورەو ململانێییەتیدا، سەرجەم هەلومەرجی بوون، رێگریەکان و غەریزەی فەردەکان بەدوو جۆری زۆر سادە تێکەڵاوی یەکتر دەبن: خاوەندارێتی تایبەتی و کار. لەگەڵ پارەدا، هەر جۆرێکی ئاڵوگۆڕو خودی ئاڵوگۆڕ بۆ فەردەکان بەشێوەیەکی رێکەوتەیی دەردەکەوێت. بەمشێوەیە پارە لەخۆگری ئەم [واقعیەتە]یە کە هەموو ئاڵوگۆڕەکانی تائێستا، تەنیا ئاڵوگۆڕی فەردەکان لەژێر

هەلومەرجی تایبەتی و نەك فەردەكان وەك فەردەكان بووە. ئەم هەلومەرجە تا ئاستی دوو مەرج دێنە خوارەوە: كاری كەڵەكەكرا و یا خاوەندارێتی تایبەتی و كاری بالفعل. ئەگەر هەر دوو یان یەكێك لەم هەلومەرجانە لەبەینا نەبن، ئاڵوگۆڕیش دووچاری وەستان دەبێت. خودی ئابووریناسەكانی وەك سیسمۆندی33و شربولیە34 و ئەوانی تر كۆبوونەوەی فەردەكانیان لەبەرامبەر كۆبوونەوەی سەرمایەكاندا داناوە. لەلایەكی ترەوە خودی فەردەكان بەتەواوی ملكەچی دابەشكردنی كارن و بەم پێیە بەرەو كامڵترین جۆری وابەستەیی لەگەڵ یەكتردا رادەكێشرێن. خاوەندارێتی تایبەتی، تا ئەو شوێنەی كە لەنا وخۆی كاردا لەگەڵ كاردا روو بەروو دەكرێتەوە. بەهۆی پێویستی بەكەڵەكەبوون گەشەدەكا و لەسەرەتادا بەگشتی شێوەیەكی ئیشتراكی هەیە. بەڵام لەگەشەی دواتری خۆیدا هەرچی زیاتر بەرەو خاوەندارێتی تایبەتی نوێ دەچێتە پێشەوە. دابەشكردنی كار هەر لەسەرەتاوە لەخۆگری دابەشكردنی هەلومەرجی كار، دابەشكردنی ئامرازەكان و بەرژەوەندییەكان و بەمشێوەیە لەخۆگری دابەشبوونی سەرمایەی كەڵەكەكراوە لەنێوان خاوەنە جیاوازەكاندا، وە لەم روەیشەوە دابەشبوونی نێوان كارو سەرمایەو نێوان شێوە جیاوازەكانی خاوەندارێتییە. هەرچی دابەشبوونی كار زیاتر بەرەو پێشەوە بچێت و كەڵەكە زیاتربێت، ئەم دابەشكردنە گەشەیەكی زیاتر پەیدا دەكات. كار خۆی تەنیا لەسەر بنەمای فەرزی ئەم دابەشبوونەیە دەتوانێت بوونی بەدەست بهێنێت.

---

(ووزەی شەخسی فەردەكانی نەتەوە جۆرا و جۆرەكان –ئەڵمانییەكان و ئەمریكییەكان– ووزەی تەنانەت لەئەنجامی زەواجی رەگەزە جیاوازەكان– نەخۆشی بلاهتی35 ئەڵمانییەكان لێرەدایە. لەفەرەنسا و ئینگلستان و هتد نەتەوە بێگانەكان دەچنە سەر زەوییەكی گەشە كردوو، وە لەئەمریكا دەچنە سەر زەوییەكی تەواو نوێوە. لەئەڵمانیا دانیشتوانی ناوچەی ئارام لەهەمان جێدا كەتیایا بوون، مانەوە).

---

بەمشێوەیە لێرەدا دوو واقعیەت ئاشكرا دەبێت[*]. یەكەم ئەوەی كەهێزەكانی بەرهەمهێنان وەك جیهانێكی تایبەت بەخۆی، بەتەواوی سەربەخۆو دابڕاوە لەفەردەكان، لەپاڵ فەردەكاندا دەردەكەوێت. هۆی ئەوە ئەمەیە ئەو كەسانەی كە ئەم هێزە بەرهەمهێنەرانە لەوانە، لەیەك دابڕاون و لەبەرامبەر یەكتریدان، بەڵام لەلایەكی ترەوە ئەم هێزانە تەنیا لەئاڵوگۆڕو بەیەكەوە پەیوەستی بوونی ئەم فەردانەدایە كە هێزی راستەقینەن. بەمشێوەیە ئێمە لەلایەكەوە تەواوێتی هێزەكانی بەرهەمهێنانمان هەیە كەبەنا و شێوەی مادییان بەخۆوە گرتووەو بۆ فەردەكانی تر نەك هێزەكانی بەرهەمهێنان بەڵكوو هێزەكانی خاوەندارێتی تایبەتین و بەم پێیە تەنیا تائەو شوێنە لەو فەردانەن كە ئەم فەردانە خاوەنانی خاوەندارێتی تایبەتی بن. هەرگیز لەهیچ دەورەیەكی پێش ئەمە، هێزەكانی بەرهەمهێنان شێوەی بێ مەیلییەكی لەم جۆرەیان سەبارەت بەئاڵوگۆڕی فەردەكان وەك فەردەكانی بەخۆیەوە نەگرتووە، لەبەر ئەوەی خودی ئاڵوگۆڕی ئەوانە هێشتا ئاڵوگۆڕێكی بەرتەسك بووە. لەلایەكی ترەوە لەبەرامبەر هێزەكانی بەرهەمهێناندا، ئێمە زۆربەی فەردەكانمان هەیە كەئەم هێزانەیان بەزۆر لەدەست دەرهاتووە، وە لەبەرئەوەی بەمشێوەیە لەهەموو ناوەڕۆكی ژیان بێبەش كراون، بوونەتە تاكە دابڕاوەكان، ئەو فەردانەی كە بەهۆی هەمان واقعیەتەوە خراونەتە جێگا و رێگایەكەوە كە لەگەڵ یەكتردا وەك فەردەكان پەیوەندی بگرن.

كار، واتە تەنیا پەیوەندییەك كەهێشتا ئەوانە لەگەڵ هێزەكانی بەرهەمهێنان و لەگەڵ بوونی خۆیان لەپەیوەندیدا دەهێڵێتەوە، سەرجەم لێك چوونەكانی خۆی بەخۆ_چالاكی لەدەستداوەو تەنیا لەرێگای رێگرتن لەگەشەكردنی ئەوانە، ژیانیان

---

[*] –[نووسینی پەراوێز لەلایەن ئەنگلس:] سیسمۆندی.

دەپارێزێت. لەکاتێکدا کە لەدەورەکانی پێشوودا خۆ_چالاکی و بەرهەمهێنانی ژیانی مادی بەهۆی ئەمەوە لەیەك جیا بوون سپێردراوە بەکەسە جیا وازەکان لەکاتێکدا کە بەهۆی کورتبینی فەردەکانەوە بەرهەمهێنانی ژیانی مادی بەشێوەیەکی نزمتری خۆ_چالاکی وەردەگیرا، ئێستا ئەوانە بەجۆرێك لەیەك جیابوونەتەوە کەژیانی مادی هەر وەك ئامانج و ئەو شتەی ئەم ژیانە مادییە بەرهەم دەهێنێت، واتە کار (ئێستا تەنیا شێوەی مومکینی خۆ_چالاکی، بەلاّم بەو جۆرە کەدەیبینین، شێوەی مەنفی ئەوە) هەر وەك هۆکار دەردەکەوێت.

## [10- پێویستی ، پێش مەرجەکان و ئەنجامی هەڵوەشانەوەی خاوەندارێتی تایبەتی]

بەمشێوەیە وەزعەکە لەحالّی ئێستادا بەجێگایەك گەیشتووە کەدەبێت فەردەکان بەتەواوی هێزەکانی بەرهەمهێنانی ئێستا بخەنە ژێر دەستی خۆیانەوە، نەتەنیا بۆ ئەوەی کەدەستیان بگات بە خۆ_چالاکی، بەڵکوو بەهۆی ئەمەوە کە لەبنەچەدا پارێزگاری لەبوونی خۆیان بکەن.

ئەم دەست بەسەرا گرتنە لەسەرەتادا لەلایەن شتێك کەدەبێت دەستی بەسەرابگیرێت، واتە لەلایەن هێزەکانی بەرهەمهێنانەوە، دیاریدەکرێت کەبەشێوەی گشتگیرییەك پەرەیان سەندووە، وەتەنیا لەچوارچێوەی ئاڵوگۆڕێکی جیهانییەو بوونیان هەیە. بەم پێیە تەنیا لەم روەیشەوە بووە، ئەم دەست بەسەراگرتنە دەبێت تایبە تمەندیەکی جیهانگیری و گونجا وی لەگەڵ هێزەکانی بەرهەمهێنان و لەگەڵ ئاڵوگۆڕدا هەبێت. دەست بەسەراگرتنی ئەم هێزانە بۆخۆی شتێك نییە جگە لەگەشەی زەمینەی فەردیەت کە لەگەڵ ئامرازە مادیەکانی بەرهەمهێناندا گونجاوە. هەر لەبەر ئەمە دەست بەسەراگرتنی تەواوی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان، گەشەی تەواوی زەمینەکانی خودی فەردەکانە.



جیا لەمە، [تایبە تمەندی] ئەم دەست بەسەراگرتنە، کەسە دەست بەسەراگیرەکانیش دیاریدەکەن. تەنیا پڕۆلیتەرەکانی سەردەمی ئێستا، کە بەتەواوی لەخۆ_چالاکی هەڵکەندراون، لەجێگایەکدان کەدەستیان بگات بەیەك خۆ_چالاکی تەواو و بێ سنور کەبریتییە لەدەست بەسەراگرتنی تەواوی هێزەکانی بەرهەمهێنان و گەشەی تەواوی زەمینەکانیشی لەگەڵدایە. تەواوی دەست بەسەراگرتنە شۆڕشگێڕیەکانی پێشوو سنوردارو پابەند بوون. کەسانێك کەخۆ_چالاکیان لەلایەن ئامرازە سەرەتاییەکانی بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕە سنوردارەکانەوە پابەند کرابوون، ئەم ئامرازە سەرەتاییانەی بەرهەمهێنیان دەخستە ژێر دەستەوەو بەمشێوەیە تەنیا دەستیان بەوەزعیەتێکی بەرتەسکی نوێ دەگەیشت. ئامرازەکانی بەرهەمهێنانی ئەوانە دەبووە سەروەتیان، بەلاّم ئەوانە خۆیان لەژێر دەسەلاّتی دابەشکردنی کارو ئامرازەکانی بەرهەمهێنانی خۆیان دەمانەوە. لەتەواوی دەست بەسەراگرتنەکانی تائێستادا، جەماوەرێك لەفەردەکان بەخزمەتکاری ئامرازی یەکەیەکی بەرهەمهێنان دەمانەوە. لەدەست بەسەراگرتن بەهۆی پڕۆلیتەریەکانەوە، کۆمەڵێك لەئامرازەکانی بەرهەمهێنان دەبێت لەخزمەتی هەر فەردێك و لەخاوەندارێتی گشتیدابێت. ئاڵوگۆڕی ها وچەرخی جیهانی ناتوانێت بچێتە خزمەتی فەردەکانەوە، مەگەر ئەوەی کەبخرێتە ژێر دەسەلاّتی هەموانەوە.

جیا لەمە، [تایبە تمەندی] ئەم دەست بەسەراگرتنە رێگای ئەنجامەکەیشی دیاریدەکات. ئەم دەست بەسەراگرتنە تەنیا لەرێگای یەك یەکێتی، کە سەرلەنوێ بەهۆی تایبە تمەندی خودی پڕۆلیتاریا تەنیا دەتوانێت یەك یەکێتی جیهانی بێت و لەرێگای شۆڕشەوە بەکردەوە دەربێت، شۆڕشێك کە لەودا لەلایەکەوە دەسەلاّتی شێوەی بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕو رێکخراوی کۆمەلاّیەتی پێشوو هەڵدەگێڕدرێتەوەو لەلایەکی ترەوە تایبە تمەندی و ووزەی جیهانی پڕۆلیتاریا کە پێویستی بە گەیشتن بەم دەست بەسەراگرتنە هەیە، دەردەکەوێت و جگە لەمە

پرۆلیتاریا خۆی لەو شتانەی کەبەرەنجامی جێگا و ڕێگای پێشووی ئەو بووە لەکۆمەڵگادا و هێشتا پێوەی هەڵواسراوە، ڕزگار دەکات. تەنیا لەم قۆناغەدایە کەخۆ ـضچالاکی فەردەکان لەگەڵ ژیانی مادیدا یەك دەگرێتەوە و ئەمە لەگەڵ گەشەی فەردەکان بەشێوەی فەردە پێگەیووەکان و دوورخستنەوەی هەموو ڕێگرییە سروشتییەکاندا یەك دەگرێتەوە. گۆڕان لەکارەوە بۆ خۆ_چالاکی لەگەڵ گۆڕان لەئاڵوگۆڕی بەرتەسکی پێشووەوە بۆ ئاڵوگۆڕی فەردەکان بەوێنەی فەرد، هاوشانە. لەگەڵ دەست بەسەراگرتنی سەرجەم هێزەکانی ئاڵوگۆڕ لەلایەن فەردە یەکگرتووەکانەوە، خاوەندارێتی تایبەتی کۆتایی پێدێت. پێشتر لەمێژوودا هەمیشە هەلومەرجێکی تایبەت هەر وەك کارێکی ڕێکەوت دەردەکەون، لەکاتێکدا ئێستا خودی گۆشەگیری فەردەکان و ڕێگای تایبەتی هەر فەردێك بۆ پەیداکردنی بژێوی خۆی، دەبێتە کارێکی ڕێکەوت.

فەیلەسوفەکان، ئەو کەسانەی کەئیتر ملکەچی دابەشکردنی کار نین، لەژێر ناوی "ئینسان" دا وەك فکرەیەك دەرخستووەو سەرجەم ئەو پڕۆسەیەی کەئێمە سەرلەوحەکەیمان شیکردوەتەوە بەپرۆسەی پێگەییینی "ئینسان" وەریان گرتووە، بەجۆرێك کە لەهەر قۆناغێکی مێژوویدا "ئینسان" خراوەتە جێی فەردەکانی تائێستا و وەك هێزی جوڵنەری مێژوو خراوەتە ڕوو. بەمشێوەیە سەرجەم پرۆسەکە بەشێوەی پرۆسەیەکی نامۆیی "ئینسان"[*] لەبەرچا و گیراوەو ئەمە لەبنەڕەتدا بەهۆی ئەم واقعیەتەوە بووە کەهەمیشە فەردی نێوەندگیری قۆناغی دواتر بەقۆناغی پێشوو، وە هووشیاری قۆناغی پێشوو بەقۆناغی دواتر دیاریکراوە. لەڕێگای ئەم ئاوازووکردنەوەیە، کەلەسەرەتاوە هەلومەرجی واقعی لەبەرچا و ناگرێت، توانیویانە سەرجەم مێژوو بگۆڕن بە پرۆسەیەکی پێگەیوویی هووشیاری.

* * *

---

[*] –[یادداشتی پەراوێزی لەلایەن مارکس:] نامۆیی.



کۆمەڵگای مەدەنی سەرجەم ئاڵوگۆڕی مادی فەردەکان لەهەناوی قۆناغێکی دیاریکراوی گەشەی هێزەکانی بەرهەمهێنان دەگرێتەوە. کۆمەڵگای مەدەنی سەرجەم ژیانی بازرگانی و پیشەسازی قۆناغێکی دیاریکرا و دەگرێتەوەو لەم ئاستەدا لەدەوڵەت و لەنەتەوە زیاتر تێدەپەڕێت، لەکاتێکدا سەرلەنوێ لەلایەکی ترەوە دەبێت لەپەیوەندییە دەرەکییەکاندا وەك نەتەوە خۆی دەرخات و لەپەیوەندییە ناوخۆییەکاندا خۆی بەشێوەی دەوڵەت ڕێك بخات. چەمکی "کۆمەڵگای مەدەنی" لەسەدەی هەژدەیەمدا، کاتێك کە پەیوەندییەکانی خاوەندارێتی یەخەی خۆی لەکۆمەڵی کۆن و سەدەکانی ناوەڕاست ڕزگار کردبوو پەیدا بوو. کۆمەڵگای مەدەنی بەم واتایە لەگەڵ بورژوازیدا دەردەکەوێت. گەرچی ئەو ڕێکخراوە کۆمەلایەتیەی کەراستەوخۆ لەهەناوی بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕدا گەشە بەدەست دەهێنێت و لەهەموو سەردەمەکانیدا ژێرخانی دەوڵەت و سەرخانی فکرەکانی تریش پێك دێنێت، هەمیشە بەم ناوەوە خوێندویانەتەوە.

## [11- پەیوەندی دەوڵەت و یاسا بەخاوەندارێتییەوە]

یەکەمین شێوەی خاوەندارێتی لەدنیای کۆن و لەسەدەکانی ناوەڕاستیشدا، خاوەندارێتی تایەفەییە کەلای ڕۆمەکان بەگشتی بەجەنگ و لای ژرمەنیەکان بەئاژەڵدارییەوە بەستراوەتەوە. لەبارەی خێڵە کۆنەکانەوە، لەو شوێنەدا کە تایەفە جۆرا و جۆرەکان بەیەکەوە لەشارێکدا دەژین، خاوەندارێتی تایەفەیی بەشێوەی خاوەندارێتییەکی دەوڵەتی و مافی تاکە کەس نیسبەت ئەوەوە هەر وەك مافی "بەکارهێنان"ی تایبەت دەردەکەوێت، هەر چەند وەك سەرجەم خاوەندارێتی تایەفەیی تەنیا بەخاوەندارێتی زەوییەوە قەتیس بوو. خاوەندارێتی تایبەتی واقعی لای خێڵە کۆنەکان، بەهەمان جۆر لای نەتەوە نوێکان لەگەڵ خاوەندارێتی گوێزراوەدا دەست پێدەکات. (کۆیلەیەتی و کۆمەڵبوون) ("خاوەندارێتی بەگوێرەی یاسا پیادەکراوەکان لەبارەی هەموو هاوولاتیانی ڕۆمەوە"). لەبارەی ئەو

نەتەوانەی کە لەنا و سەدەکانی ناوەڕاستدا سەریان دەرهێنا، خاوەندارێتی تایەفەیی لەرێگای بڕینی قۆناغە جۆرا وجۆرەکان _خاوەندارێتی زەوی گوێزرایەوە، خاوەندارێتی رشتەیی گوێزراوە، سەرمایەی بەکار هاتوو لەمانیفاکتۆر _ بەسەرمایەی ها وچەرخ، واتە بەخاوەندارێتی تایبەتی رووت، گەشەدەکات کە لەلایەن پیشەسازی گەورەو ململانێی جیهانییەوە دیاریدەکرێت و هەموو لەیەك چوونەکانی خۆیان بەئورگانێکی ها وبەش وەلاناوەو بووەتە رێگر لەبەردەم دەوڵەت بۆ سەپاندنی هەر نفوزێك لەسەر [رەوتی] گەشەی خاوەندارێتی.
ئەم خاوەندارێتییە تایبەتییە نوێیە ها وکاتە لەگەڵ دەوڵەتی نوێدا کە لەڕێگای خاوەنەکانی خاوەندارێتییەوە وردە وردە لەرێگای باجەکانەوە کڕدراوە، لەرێگای قەرزە نەتەوەیەکانەوە بەتەواوی کەوتۆتە دەستی ئەم کڕیارانەوەو بوونی ئەوی بەهەمان جۆر کە لەسەروژوورکردنی وەرەقە قەرزیی دەولەتییەکان لەبازاڕی بۆرسەدا رەنگ دەداتەوە، بەتەواوی بەستراوەتەوە بەئیعتیباراتی بازرگانییەك کە خاوەنانی دارایی، بورژواکان، خستوویانەتە بەر دەستیەوە. بورژوازی تەنیا بەهۆی ئەم واقعیەتەوەیە کە ئیتر نەیەك توێژ بەڵکوو یەك چینە، ناچار دەبێت کە خۆی نەك بەشێوەی نا وچەیی بەڵکوو لەئاستی نەتەوەدا رێکخرا وبکات و شێوەیەکی گشتی ببەخشێتە بەرژەوەندیە نێوەندیەکانی خۆی. لەگەڵ رزگار بوونی خاوەندارێتی تایبەتی لەکۆمەڵەکاندا دەوڵەت بووەتە هەویەتێکی سەربەخۆ لەپاڵ و دەرەوەی کۆمەڵگای مەدەنی. لەگەڵ هەموو ئەمانەدا دەوڵەت شتێك نییە بێجگە لەو جۆرە رێکخراوەی کەبورژواکان، بەگوێرەی مەبەستە نا وخۆیی و دەرەکیەکانی، بۆ دابینکردنی بەرامبەری خاوەندارێتی و بەرژەوەنیەکانیان، ناچار بوون بەدەستیەوە بگرن. سەربەخۆیی دەوڵەت ئەمڕۆ تەنیا لەو وولاتانەدا دێتەدی کە توێژەکان هێشتا بەتەواوی بەشێوەی چینەکان گەشەیان نەکردووە، ئەو جێگایانەی کە توێژەکان، کە لەوولاتە پێشکەوتووترەکاندا لەنا و چوون، هێشتا دەورێك دەگێڕن و تێکەلاوێك [لەتوێژەکان] هەیە و لەئەنجامدا هیچ بەشێك



لەدانیشتوان نا توانێت دەسەلات بەسەر بەشەکانی تردا پەیدا بکات. مەسەلەکە لەئەڵمانیا بەتایبەتی وەك ئەمە وایە. پێگەیووترین نموونەی دەوڵەتی ها وچەرخ ئەمریکای باکورە. نووسەرە نوێکانی فەڕەنسا و ئینگلستان و ئەمریکا هەموویان ئەم باوەڕەی کەدەوڵەت تەنیا بەهۆی خاوەندارێتی تایبەتیەوە هەیە دەردەبڕن، بەجۆرێك کەئەم رایە بەگشتی لەئاستی فەردە ئاساییەکانی کۆمەڵگاش دا قبوڵکراوە.
لەو شوێنەوە کەدەوڵەت شێوەیەکە کە کەسەکانی چینی فەرمانڕەوا بەرژەوەندییە ها وبەشەکانی خۆیانی تیادا دەردەخەن، وەلەودا سەرجەم کۆمەڵگای مەدەنی دەورانێك دەردەکەوێت، ئەم ئەنجامە دێتە دەست کەهەموو ئورگانە گشتییەکان بەیارمەتی دەوڵەت دادەمەزرێن و شێوەیەکی سیاسی وەردەگرن. خۆش خەیاڵبوون بەوەی کەیاسا لەسەر بنەمای ئیرادەو ئەویش لەسەر بنەمای ئیرادەیەکە کەلەپایەی واقعی خۆی، واتە ئیرادەی ئازاد، جیاکراوەتەوە، لێرەدایە. بەهەمان پێوانە عەدالەتیش بەگوێرەی خۆی دادەبەزێنرێت بۆ یاسا دانراوەکان.
یاسای مەدەنی ها وکات لەگەڵ خاوەندارێتی تایبەتی بەپوکانەوەی کۆمەڵبوونە سروشتییەکان پێش دەکەوێت. لای رۆمەکان گەشەی خاوەندارێتی تایبەتی و یاسای مەدەنی بەرهەمێکی پیشەسازی یا بازرگانی زیاتر نییە، چونکە هەموو شێوەی بەرهەمهێنانی ئەوانە گۆڕانی بەسەردا نەهات[*]. لەلای نەتەوە نوێکان، لەو شوێنەدا کە کۆمەڵە فیودالییەکان لەلایەن پیشەسازی و بازرگانی لەبەر یەك هەڵوەشایەوە، بەدەرکەوتنی خاوەندارێتی تایبەتی و یاسای مەدەنی قۆناغێکی نوێ دەستی پێکرد کە توانای گەشەی زۆرتری هەبوو. هەمان یەکەمین شارێك کەلەسەدەکانی ناوەڕاستدا بازرگانی دەریایی بەرفرا وانتری هێنایە کایەوە، واتە ئامالفی لەهەمان کاتدا یاساکانی کەشتیەوانیشی گەشە پێدا. بەتەنیا ئەوەی کە

*–[نووسینی پەراوێز لەلایەن ئەنگلس:] (سوو!)

پیشەسازیو بازرگانی خاوەندارێتی تایبەتیان زۆر گەشە پێداوە، سەرەتا لەئیتالیا و دواتر لەباقی وولاتەکان بێ دابڕان یاسای مەدەنی زۆر پێشکەوتووی رۆمی دووبارە بەدەستەوە گیرایەوەو گەیشتە پلەی معتەبەر. دواتر کە بوژوازی دەسەلاتێکی وەهای دەستکەوت کەشازادەکان بەرگری کردنیان لەبەرژەوندیەکانی ئەو قبوڵکرد تالەرێگای بورژوازییەوە خانەدانەیی فیودالی لەنا وبەرن، پێشکەوتنی واقعی یاسا لەهەموو وولاتەکاندا_لە فەرەنسا لەسەدەی شانزەیەم دا_ دەستی پێکرد کەلەهەموو وولاتەکاندا جگە لەئینگلستان لەسەر بنەمای کۆمەڵێك لەیاساکانی رۆم بەرەو پێشەوەچوو. لەئینگلستانیش بۆ پێشکەوتنی زیاتری یاسای مەدەنی (بەتایبەتی لەبارەی سامانە گوێزراوەکانەوە) ناچارانە دەبوایە ئسوڵی حقوقی رۆم با و بێت. (نابێت پشتگوێ بخرێت کەیاساش وەك دین مێژووی سەربەخۆی نییە).

لەیاسای مەدەنیدا پەیوەندییەکانی خاوەندارێتی وەك ئەنجامی ئیرادەی گشتی رادەگەیەنرێت. خودی "مافی سوود وەرگرتنو مافی بەکارهێنان" لەلایەکەوە بەیانکەری ئەم واقعیەتەیە کەخاوەندارێتی تایبەتی بەتەواوی لەکۆمەڵەکان سەربەخۆیەو لەلایەکی ترەوە بەیانکەری ئەم وەهمەیە کە خاوەندارێتی تایبەتی بەتەنیا لەسەر بنەمای ئیرادەی تایبەتی، واتە بەکارهێنانی ئارەزووانەی شتێك راوەستاوە. بەکردەوە هەر بەو جۆرەی خاوەنداری تایبەت نەیەوێت خاوەنداریەتییەکەیو لەئەنجام دا "مافی سوود وەرگرتن"ەکەی بکەوێتە دەست ئەوانی ترەوە، ئەم مافی بەکارهێنانە، رێگری ئابووری تەواو دیاریکراوی دەبێت بۆئەو، چونکە کەلەراستیدا ئەو شتە، ئەگەر بەتەنیا لەپەیوەند بەئیرادەی ئەوەوە لەبەرچا و بگیرێت، لەبنەچەدا هیچ نییە، بەڵکو تەنیا لەئاڵوگۆڕ_وسەربەخۆ لەیاسا _دایە کە دەگۆڕێت بەشتێك، بەداراییەکی راستەقینە. (پەیوەندییەك کە



فەیلەسوفەکان ئەوە بەفکر دەخوێننەوە)[*]. ئەم وەهمە حقوقییە کە یاسا دادەبەزێنێتە ئاستی ئیرادەی رووتەوە، لەگەشەی زیاتری پەیوەندیەکانی خاوەندارێتیدا ناچارانە رادەکێشرێتە ئەو مەوقعیەتەوە کەشەخسێك لەوانەیە سەبارەت بەشتێك مافی یاسایی هەبێت بەبێ ئەوەی کەبەراستی خۆی ئەو شتەی هەبێت. ئەگەر بۆنموونە داهاتی پارچەیەك زەوی بەهۆی ململانێوە لەنا و بچێت، ئەوکاتە خاوەنەکەی بێ ئەم لاولا مافی یاسایی ئەوەی لەگەڵ "مافی سوود وەرگرتنو مافی بەکارهێنان"ی سەبارەت بەو هەیە، بەڵام ناتوانێت کارێکی پێبکات: ئەو وەك خاوەندارێکی خاوەن زەوی نابێتە خاوەنی هیچ شتێك ئەگەر لەجێگایەکی تردا سەرمایەی تەواوی بۆ چاندنی ئەم زەوییە نەبێت. ئەم وەهمەی مافناسەکان ئەم واقعیەتەش روون دەکاتەوە کە بۆ ئەوان، هەر وەك ئەوەی کەبۆ هەر کۆمەڵە یاسایەك، لەهەر لایەکەوە رێکەوتانەیە کە فەردەکان لەگەڵ یەکتریدا پەیوەندی دەبەستن (وەك پەیمان بەستنەکان). ئەمەش رووندەکاتەوە کەبۆچی مافناسەکان گومانیان لەوە هەیە کەبتوانرێت بەپێی ئیرادە بچێتە نا و ئەم پەیوەندیانەوە یان نا، وە ئەوەی کەناوەڕۆکی ئەم پەیوەندیانە رێك لەسەر بنەمای ئیرادەی فەردی دوولایەنی پەیماننامەکە وەستاوە.

لەهەر شوێنێکدا کە لەرێگای گەشەی پیشەسازیو بازرگانی شێوە نوێکانی ئاڵوگۆڕ (وەك کۆمپانیاکانی دابینکردنو هتد) گەشەیان کردبێت، هەمیشە یاسا هاتۆتەناوەوە تائەوانە لەنێوان شێوەکانی دەستکەوتی داراییدا قبوڵ بکات.[ش]

---

[*] –[نووسینی پەراوێزلەلایەن مارکس:] لای فەیلەسوفەکان، پەیوەندی = فکر. ئەوانە تەنیا پەیوەندی ئینسان بە شێوەیەکی گشتی لەگەڵ خۆیاندا دەناسنو هەر بۆیە تەواوی پەیوەندییە واقعیەکان بۆ ئەوانە دەبنە فکرەکان.

[ش] –یادداشتەکانی ژێرەوە، کە هی مارکسە،بەمەبەستی تەواوکردنی زیاتر نووسراون.(ر)

## [12-شێوەکانی هووشیاری کۆمەڵایەتی]

کاریگەری راستەوخۆی کار لەسەر زانست.

دەوری سەرکوتکردن لەلایەن دەوڵەت، یاسا، ئەخلاقیاتەکان و هتد.

بورژوازی رێک بەهۆی ئەمەوە کەوەک چینێک فەرمانڕەوایی دەکات، دەبێت لەلایەن یاساوە بەیانێکی گشتی بدات بەخۆی.

زانستی سروشتی و مێژوو.

هیچ جۆرە مێژوویەکی سیاسەت، یاسا، زانست، و هتد..و یا مێژووی هونەر، دین و هتد بوونی نییە*.

---

بۆچی ئایدیۆلۆژیسینەکان هەموو شتێک هەڵدەگێڕنەوە.

رۆحانیەکان، مافناسەکان، سیاسەتمەداران.

مافناسەکان، سیاسەتمەدارەکان (دەوڵەتمەداران بەشێوەیەکی گشتی)، ئەخلاقیات، رۆحانیەکان.

بۆ ئەم دابەشکردنە فەرعیانە لەنا و یەک چیندا: (1)بەهۆی دابەشکردنی کار، ئیش کردن شێوەی بوونێکی سەربەخۆ بەخۆیەوە دەگرێت. هەر کەسێک پێی وایە کەپیشەکەی ئەو پیشەیەکی حەقیقییە. وەهمەکان لەبارەی پەیوەندیەکانی نێوان پیشەی ئەوان و واقعیەت، بەهۆی خودی سروشتی پیشەکەوە، زیاتر لەوانەیە کەلای ئەوان پەروەردەو پارێزرا و بکرێت. لەهووشیاری _لەئیدارە کردن، سیاسەت و هتد_ پەیوەندیەکان دەبنە چەمکەکان لەو شوێنەوە کەئەوانە لەم پەیوەندیانە زیاتر تێناپەڕن، چەمکی ئەم پەیوەندیانەش لەزەینی ئەواندا دەبێتە

* –[نووسینی پەراوێز لەلایەن مارکس:]تێگەیشتنی دیذی بەتایبەتی لەگەڵ شێوەیەک لە "کۆمەڵبوون" کە لەدەوڵەتی کۆن و فیودالیزم و لەسەڵتەنەتی رەهادا دەردەکەوێت، لەگەڵ ئەم جۆرە پەیوەندییەدا دێتەوە.



چەمکێکی گشتی جێگیر. بۆ نموونە قازی یاسا جێبەجێ دەکات، لەم رووەوە یاسادانان بەهێزێکی جەولێنەری واقعی و کاریگەر حساب دەکات. ئیعتیباردانان بۆ کاڵاکانی خۆ، لەبەر ئەوەی پیشەکەی ئەوان دەچێتە سەر مەسەلە گشتییەکان.

فکرەی یاسا. فکرەی دەوڵەت. لەهووشیاری باودا مەسەلەیەکی ئاوەژووە.

---

دین لەسەرەتادا هووشیارییەکی بەرزە (لەسەرو زانینەکان و ئەزموونی بەشەری) کەتوانایی لەهێزە بالفعل هەبووەکانەوە وەردەگرێت.

---

سوونەت لەپەیوەند بەیاسا و دین و هتد.

ص فەردەکان هەمیشە لەخۆیانەوە حەرەکەتیان کردووەو لەخۆیانەوە حەرەکەت دەکەن. پەیوەندیەکانیان، پەیوەندی رەوەندی ژینی واقعی ئەوانە. چۆن ئەوە روو ئەدات کە پەیوەندییەکانی ئەوان بوونێکی سەربەخۆو دژ بەوان بەخۆوە دەگرێت و هێزەکانی ژیانی خۆیان بەسەر ئەواندا زاڵدەبێت؟

لەیەک قسەدا: دابەشبوونی کار، کەئاستەکەی بەستراوەتەوە بەفراوانبوونی هێزەکانی بەرهەمهێنان لەهەر دەورانێکی تایبەتدا.

---

خاوەنداریێتی زەوی. خاوەنداریێتی هاوبەشی، فیودالی، هاوچەرخ. خاوەنداریێتی رشتەیی. خاوەنداریێتی مانیفاکتۆری. سەرمایەی پیشەسازی.

ص –ئەم لاپەڕەیەی دوایی لەدەستنووسەکەدا ژمارەی لێنەدراوە. ئەم لاپەڕەیە چەند یادداشتێکی لەپەیوەند بەسەرەتای باسکردنی دنەرەکان لەتێگەیشتنی مادیەتی مێژوو هەیە. فکرەیەک کەلێرەدا سەرلەوحەکەی هاتووە، لەبەشی سێیەمی نوسخەی پاکنووسکراوەکەدا هاتووە. (ر)

## تێبینی یەکان

1–ئیشارەتە بۆ لودویگ فیورباخ

2–ئیشارەتە بۆ برۆنۆ بوئر

3–ئیشارەتە بۆ ماکس شترنر

4– هیگلی یە لاوەکان: ئەم چەمکە لەبارەی ئەو دەستە لە دۆستان و لایەنگران و قوتابیانی هیگل بەکار هاتووە کە لە دەیەکانی سێیەم و چوارەمی سەدەی نۆزدەهەمدا ئەنجامێکی دژی فیودالی و دژی دینی و تەنانەت شۆڕشگێڕانەشیان (بەمانا بورژوازی یەکەی) لێدەگرت. هیگلییە لاوەکان زیاتر ئارەزوویان بەلای میتۆدی دیالکتیکیدا هەبوو. بەشێوەیەکی تایبەت هیگلییە لاوەکان ئاشتی فەلسەفەیان لەگەڵ سەڵتەنەت و کڵێسادا دەدایە بەر نەفرەت و رەخنەو بەم هۆیەیشەوە هاوچەرخەکانیان پێیان دەوتن هیگلییە لاوەکان (دابەشبوونی چەپ و راست بۆ یەکەم جار لەلایەن شتراوس لەساڵی 1837 بەبەراورد کردن بەدابەشبوونە سیاسییەکانی ئەنجومەنی فەرەنسا دانرا).

روانگەی کۆمەڵایەتی هیگلییە لاوەکان ناکۆکییە کۆمەڵایەتییەکانی ئەڵمانیا بوو لە دەورانی پێش شۆڕشی 1847. لەبەر ئەمە وەك رەوتێکی سیاسی و رادیکال ترین بەشی بورژوازی لە دژایەتیکردنی فیودالی دەژمێردرا. مارکس و ئەنگلس پێش ئەوەی ببنە خاوەنی میتۆدێکی کامڵ خۆیان لە هیگلییە لاوەکان زۆر بەنزیك دەزانی. کەسە ناسراوەکانی ئەم رەوتە بریتیبوون لە (شتراوس، شترنر، روگە، برۆنۆو هەروەها فیورباخ و ). هیگلییە لاوەکان چەندان جار دەستیان برد بۆ بلاوکردنەوەی ساڵنامە جۆراو جۆرەکان کە زۆربەی جار لەلایەن پۆلیسی دەوڵەتی (پ.روس و ساکسن)ەوە راگیران. (و.ك)

5–ئیشارەتە بۆ بەرهەمێکی دیوید فریدریك شتراوس بەناوی "ژیانی عیسا" بلاوکراوەی ساڵەکانی 1835– 1836. لەگەڵ بلاوبوونەوەی ئەم بەرهەمەدا رەخنەی فەلسەفی دینی و پەرتەوازەبوونی رەوتی هیگلی بە هیگلییە لاوەکان و هیگلییە کۆنەکان یان پیرەکان دەستی پێکرد.

6–دیادۆخی –کاربەدەستەکانی ئەسکەندەری گەورە بوون کە لە دوای مردنی ئەو نەبەردێکی بێ بەزەییانەیان لەسەر دەسەڵات دەست پێکرد. لەرەوەندی ئەم نەبەردەدا کە لە کۆتایی سەدەی چوارەم و سەرەتای سەدەی سێیەمی پێش زایین رووی دا، ئیمپراتۆری ئەسکەندەر کەیەکێتییەکی سەربازی و ئیداری ناجێگیر بوو دابەش بوو بەسەر چەند دەوڵەتێکدا.



7–زاراوە ئەساسییەکانی دیوید فریدریك شتراوس و برۆنۆ بوئر.

8–ئیشارەتە بۆ ماکس شترنر

9–زاراوە ئەساسییەکانی فیورباخ و ماکس شترنر.

10–گەڕانەوەیەك بۆ لودویك فیورباخ، برۆنۆ بوئر و ماکس شترنر کە زاراوە ئەساسییەکانی ئەوان یەك لەدوای یەك بریتیبوون لە "ئینسان"، "رەخنە"، "خود".

11–مەبەست لە پێش مەرجەکان (premises) پێش مەرجە مادیییە پێویستەکانە بۆ کارێك یا حاڵەتێك و نابێت ئەوانە بە فەرز وەرگرتن و دیا وێناکردن و لەجۆری ئەوانە لێك بدرێتەوە (و.ف)

12–زاراوەی ئەڵمانی verkehr (ئاڵوگۆڕ) بەمانایەکی فراوان بەکار دەهێنرێ و سەرجەم ئاڵوگۆڕە مادی و مەعنەویەکانی کەسەکان، گروپە کۆمەڵایەتیەکان و وڵاتەکان دەگرێتەوە. مارکس و ئەنگلس ئەوە دەردەخەن کە ئاڵوگۆڕی مادی ئینسانەکان و پێش هەموو ئەوانەش ئاڵوگۆڕی ئینسانەکان لە پرۆسەی بەرهەمهێنان، بنەمای سەرجەم شێوەکانی ئاڵوگۆڕ پێکدەهێنێت. زاراوەی "شێوەی ئاڵوگۆڕ"، "شێوە"، "پەیوەندیەکانی ئاڵوگۆڕ" و "پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕ" لەلایەن مارکس و ئەنگلس لە ئایدیۆلۆژی ئەڵمانیدا بەکار دەهێنن تا مەفهومی "پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنان" کە لە حاڵەتی ئەوەدا بوو کە لەزەینی ئەواندا شکڵ بگرێت، بەیان بکات.

13–یاسای زەوی کە لەلایەن لیسینیوس و سکستیوس و تریبیۆنەکانی خەڵکی رۆمەوە پێشنیار کرابوو، لەساڵی 367ی پێش زایینیدا بەهۆی تێکۆشانی پلبیزەکان پەسند کراو توانای هاوولاتیانی رۆمی بۆ بوونی زەوی بەرتەسك کردەوە.

مەبەست لەجەنگە ناوخۆیەکانی رۆم بەگشتی دووژمنایەتییە ناوخۆیەکانی چینی دەسەڵاتداری رۆمە کە لەکۆتایی سەدەی دووەمی پێش زایین و تا ساڵی 30ی پێش زایینی درێژەی کێشا. ئەم جەنگانە یەکێك بوون لەهۆکارەکانی زوو پوکانەوەی کۆماری رۆم و دامەزراندنی ئمپراتۆریەتی رۆم لەساڵی 30 پێش زایینیدا.

*14*–پلەبین: ناوێك بوو کە لەرۆمی کۆندا بەخوارترین توێژی کۆمەڵایەتی دەوترا. (و.ك)

*15*– مەبەست لەکرێکاری شارەزای رشتەکان یان پیشەکان (Journeyman) ئەو کرێکارانەیە کە لەدوای ساڵانێکی شاگردی شارەزاییان لەکارەکەی خۆیاندا وەردەگرت. ئەم کرێکارانە لە ئاستی پەو پایە نێو خۆییەکانی رشتەکاندا هێشتا لەگەڵ وەستاکاندا جیاواز بوون، گەرچی شاگردییان تێپەڕاند بوو. ئاساییە کە ئەم کرێکارانەی رشتەکان لەسەدەکانی ناوەڕاستدا نابێت لەگەڵ کرێکاری شارەزا بەمفهومی ئەمڕۆ وەك یەك وەربگیرێ. (و.ف)

16–مەبەست لەئینسیجام (consistrcy) لێرەدا یەك پارچەیی ناوخۆیی روانگەیەكو یەكهاتنەوەی منگقی بەشەكانێتی. روانگە یان بۆچوونی منسجیم، كە ئەوەیان بەیەكهاتنەوەش وەرگێڕاوە، روانگە یان بۆچوونێكە كە بەشەكانی لەگەڵ یەكتردا هاتوونەتەوەو تا دوا بەشەكانو ئەنجامەكانیشی لەگەڵ یەكتردا بێتەوە.(و.ف)

17– دێڕێكی وەرگێراوی فاوستی بەرهەمی گۆتەیە.

18–كامپانیادی رۆما: لەكۆندا سەر زەوییەكی خۆشو ئاوەدانو سەوزاییو جێگای حەوانەوەی زستانانەی رۆمانیەكان بوو.لەسەدەكانی ناوەڕاستدا بووە وێرانەو تا دوای مەرگی ماركس ئاوەدان نەكرایەوە. ئێستا یەكێكە لەناوچە بەناوبانگەكانی ئیتالیا.(و.ك)

19–ئەگستۆس: ئیمپراتۆری رۆما، (63–14)ی پێش زایینی.(و.ك)

20–سیستەمی قارەیی یان گەمارۆی ووشكانی، ئەو بڕیارانەیە كە لەلایەن ناپلیۆن بۆناپارتەوە لەدوای شكستی پرۆس دانران و بەگوێرەی ئەوە بازرگانی وڵاتەكانی قارەی ئەورووپا لەگەڵ بەریتانیادا قەدەغە كرابوو. ئەم بڕیارانە هاتنی كاڵاكان، لەوانە شەكرو قاوەی بۆ ئەورووپا زۆر دژوار كرد.

21–مەبەست لە "كار"لەچەمكی هەڵپێچان یان هەڵوەشاندنەوەی كار هەڵسوڕانی داهێنەرانەی ئینسانی نییە، كە ماركس هەر لەم بەرهەمەدا پێی دەڵێت خۆ–هووشیاری ئینسانو بێگومان شایانی هەڵپێچان نییە، بەڵكو كاری ژێر هەلومەرجی سەرمایەداریو یا بەمانایەكی وورتر "كاری بەكرێ"یە. بەم پێیە هەر كاتێك لەم دەقەدا باس لەهەڵوەشاندنەوەی كار كرا، دەبێت ئەوە بەهەڵوەشاندنەوەی كاری بەكرێ بزانرێت.(و.ف)

22–ساڵنامەكانی هالەیی و ساڵنامەكانی ئەڵمانی بڵاوكراوەی هیگلییەلاوەكان بوون كە بەدوای یەكتردا لەكۆتایی دەیەی سیو سەرەتای دەیەی چلی سەدەی نۆزدەیەمدا بڵاوكرانەوەو دواتر لەلایەن حكومەتەوە بەر بەبڵاوبوونەوەیان گیرا.

23–مەبەست لە برۆنۆ بوئرو لودویگ فیورباخو ماكس شترنرە.

24– گۆرانییەكانی رینئەو شعرە باوانە بوون كە لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا لەلایەن ناسیونالیستەكانی ئەڵمانیاوە زۆر سوودی لێوەردەگیراو چەندەها جار مۆسیقایان بۆ دانابوون.

25– ئەلزاسو لرن: دوو ناوچەی فەرەنسا بوون كە ناسیونالیستەكانی ئەڵمانیا هەمیشە بیریان لەوە دەكردەوە بیان لكێنن بەئەڵمانیاوە.(و.ك)

26– یاكوب وندی: (1805–1871) رۆژنامە نووسی رادیكاڵی ئەڵمانی كە دوای شۆڕشی 1848 هەڵوێستێكی میانڕەوی لیبرالیانەی گرتەبەر.(و.ك)



27–ئیشارەتی دانەرەكانە بۆ ووتارێكی فیورباخ كە بەم جۆرە كۆتایی دێت: "لەبەر ئەوە ف.[فیورباخ]نە یەك ماتەریالیستە، نە یەك ئایدیالیستەو نە یەك فەیلەسووفی هەویەتی. كەواتە ئەو چیە؟ ئەو لەئەندێشەدا هەر ئەوەیە كە لەدنیای واقعیدا هەیە، لەرۆحدا هەر ئەوەیە كە لەبەدەندا هەیە، لەخوددا هەر ئەوەیە كە لەكاریگەری هەستپێكراویدا هەیە. ئەو ئینسانەو یا باشتر بڵێین، لەو شوێنەوە كە ف.خودی ئینسان بەكۆمەڵبوون (community) دەزانێت، ئەو ئینسانێكی كۆمەڵایەتی (هاوبەشی communal)یە، ئەو یەك كۆمۆنیستە".

28–پیشەسازی دەرهێنان چەمكێكە كە لێرەدا مەبەست لێی راو و راوەماسیو دەرهێنانی كانزایە.

29– كۆمەڵەی دژی یاسای دانەوێڵە ئەنجومەنێك بوو كە لەساڵی 1838 لەئینگلستان دامەزراو بۆ هەڵوەشاندنەوەی یاساكانی دانەوێڵە هەڵدەسوڕا. بەریتانیا لەسەدەی پانزەیەمدا خاوەنی چەند یاسایەك بوو بۆ بەرتەسك كردنەوەی هێنانی گەنمو دانەوێڵە تا بەم هۆیەوە بەر بەهاتنە خوارەوەی نرخی ئەوانە لەبازاڕی ناوخۆیدا بگرێت. ئەم یاسایانە كە پارێزەری بەرژەوەندیەكانی نەجیبزادە خاوەن زەویەكانی بەریتانیا بوو، بووە هۆی نارەزایەتی فراوانی خەڵك، بورژوازی پیشەسازی بەریتانیا بەسوود وەرگرتن لەم نارەزایەتیانە لە سەدەی نۆزدەیەمدا خەباتێكی فراوانی بەمەبەستی هەڵوەشاندنەوەی ئەم رێگریانەو دابینكردنی ئازادی تەواوی بازرگانی بەرەو پێشەوە برد كە ئامانجەكەی لاواز كردنی جێگاو رێگای خانەدانەیی زەویدارو كەم كردنەوەی خەرجی ژیان–و لەئەنجامدا زەمینە خۆش كردنی كەم كردنەوەی كرێ–ی كرێكاران بوو.

30–باجە جیاكەرەوەكان: بەو باجانە دەوترێ كە هەندێك لەووڵاتە ئەورووپیەكان بەمەبەستی زەربەدان لەئابووری نەیارەكانی خۆیان بۆ یەك كاڵای هاوجۆر بەپێی ئەوەی لەكام وڵاتەوە هێنراوە رێژەی گومرگی جیاوازیان لەسەر دائەنا.(و.ك)

31–هەڵوەشاندنەوە (Aufhebung): چەمكێك كە لەلایەن هیگلەوە بەكار دەهێنراو دەلالەتی لەنەمانی شكڵێكی كۆن بەپاراستنی ناوەڕۆكە مثبتەكەی لەشكڵە نوێكەدا، كەجێگای ئەو دەگرێتەوە، دەكرد.

32–پەیمانی كۆمەڵایەتی: دانراوی ژان ژاك رۆسۆ.

33–سیسمۆندی: ئابووری ناسو مێژوونووسی ناسراوی سویسری (1773–1842). لینین لە كتێبی (دەربارەی تایبەتمەندی رۆمانتیزمی ئابووری)دا ئەڵێ كە ئەو لەروانگەیەكی ووردە بورژوازیانەوە ئابووری سەرمایەداری ئەداتە بەر رەخنە.(و.ك)

34–شربولی: یەكێكە لە قوتابیەكانی سیسمۆندی.(و.ك)

35–نەخۆشی بلاهت: Cretinism (نەخۆشی لە بیر چوونەوە).

# فەهرەست